# ڕەنگین

RANGEEN



ژمارە ١٤٤ - کانوونی دووهەم ساڵی ٢٠٠١

## گەڕانەوەی چوارەم ..
## نابووت بوونی بەریتانیاو ئەمەریکایە



# ڕەنگین
## مجلة شهرية سياسية عامة
تصدرها دار الثقافة والنشر الكردية في وزارة الثقافة

العدد ١٤٤ – كانون الثاني – ٢٠٠١



## ڕێبازی ڕەنگین

### گەرانەوەی چوارەم و ... نابووت بوونی بەریتانیاو ئەمەریکا

خالید خۆشناو
سەرنووسەر

بۆ دە ساڵ پتر دەچێ‌و ، ئەمەریکاو بەریتانیای پاشبەندی ، بەهاریکاری زایۆنیزم ، بەئاشکراو لە سایەی سێبەری نەتەوە یەکگرتووەکاندا ، کە دەستەمۆی ئەمەریکایە ، دەست درێژیی یەك لەدوای یەك ... دەکەنە سەر خاك و گەلی عیراق ئەگەر چی جار لەدوای جار پیلانەکانیان زیاتر بۆ گەلان و حوکمەتان رونتر دەبێتەوەو تارای رەشیان بەسەرەوە رادەماڵرێ.. لەگەڵ تەقینەوەی دوا ڕاپەرینی ئەقسای پیرۆزدا ، سەرەکی فەرماندە صدام حسین خوابیپارێزی بەو واتایە فەرمووی ، بۆ لەئەمەریکا دەترسن ، لێتان دەدا ، خۆ مەگەر لەساڵی ١٩٩١ دا لەعیراقی نەداو ، هەر بەردەوامیشە ، چی‌رووی داوو جیمان لێ‌هات ، ؟ تەنانەت ئەوەی خاپووریش کرا ، بیناکرایەوە ، عیراقیش هەر بەسەربەرزی مایەوە ، ... جا تاکەی نابزوێن و..؟ رەگی‌پیاوەتیتان ناجوولێ؟ هەر بۆیە دەست درێژیەکەی ئەمجارەیان ، بەو مەبەستەوە بوو کە عیراق و سەرکردەی بلیمەتی ناچارکەن دەست لەکێشەو گەلی فەلەستین بکێشێتەوە ... کەواتا شالاوی نامەردانەی ئەمجارەیان کە لە خاکی کوێت و سعوودی‌یەو ئاوی کەنداوی عەرەبەوە تەپو تۆزی قەلە رەشەکانیان بەرپابوو ، لەبەر خاتری چاوی کاڵی زایۆنی بوو .. ئەگەر چی ئەنجامەکانی بەپێچەوانەوە گیرسایەوەو زیاتر ڕای گشتیی نیودەوڵەتی بەلای عیراقدا لای‌دا ، ئەڵقەی تری گەمارۆی ستەمکارانە دارما ... رووڕەشی بۆ ئەمەریکاو بەکری‌گیراوانی‌مایەوە . عیراقیش هەرعیراقەو سەرۆکی خۆشەوسیتی هەر ((صدام حسین))ە خوابیپارێزی .

# في هذا العدد



دار الثقافة والنشر الكردية
العنوان / بغداد الوزيرية / قرب المعهد القضائي
ص. ب / ٣٩١٧
هاتف ٤٢٥١٨٤٥
ڕەنگین نرخی ١٠٠ دینارە

رەنگین
مجلة شهرية سياسية عامة
تصدرها
دار الثقافة والنشر الكردية
بغداد

رئيس التحرير :
مصلح الجلالي

كۆڤارێكی مانگانەی سیاسی گشتییە

سەرنووسەر **مصلح جەلالی**













## جەژنێك

دەزگاكەمان لە رۆژی ٩ی مانگی ئاداری هەموو سالێك دا ئاهەنگ دەگێرێت و ئەم رۆژە دەكا بە جەژن. ئەوەبوو ئێوارەی رۆژی پێنج شەممەی ٣/٩ لە یانەی یەكیەتیی نووسەران و ئەدیبانی عیراق لە بەغدا ئاهەنگێكی شەوانەی خێزانی رێك خست كە تا نیوەشەو ئاوازی دەهۆل و زورنای كوردەواری و مۆسیقای باندی رۆژاوایی و گۆرانیو مەقامی كوردی شەپول شەپۆل تێكەل بە هەستی شادو قریوەو هەرای سەرچۆپی كێش و رەشبەلەك گێران بوو. .

ئەم رۆژەش كە مامۆستا مصلح جەلالی لەوتاری سەرەتای ئاهەنگدا وتی بە جەژنی رۆشنبیری كوردی داندراوە ، كە لەو رۆژەدا سەرۆكی تێكوشەر صدام حسین تەشریفی هێنا بۆ دەزگا ی روشنبیریو بلاوكردنەوەی كوردیولەوتوویژ كردندا لەسەر بەنامەو پلانی كاری دەزگاكە بەشداری كردو گەلێ رێنمایی دەست نیشان كرد كەبوون بەرێبازی رۆشنبیری كوردیو راپەرینەكەیان پەرەپێدا كە ئێمە لەبەر رووناكیی ئەم وتە بە نرخانەی سەرۆك دا بەلێنی بەگورخستنی كاروانەكەمان دەدەین بەرەپێشەوەو پێشەوەتر .

بەم بۆنە یەشەوە رێزو سلاوی روشنبیرانی كورد بە سەرۆكی بەرێزو بەم جەژنە رادەگەیەنین .

رەنگین

رەنگین
ناونیشان: بەغداد
دەزگای روشنبیریو بلاوكردنەوەی كوردی
وەزیریە. تەنیشت المعهد الفضائي
ت ٤٢٥١٨٤٦ پێنج خەتە
سكرتێری نووسین: ٤٢٥٧٠٢٥

نرخی ٥٠٠ فلسە

سكرتێری نووسین **مصطفی نەریمان**

دەرهێنانی هونەری: نزار بەزاز

**دار الحرية للطباعة**

# صدام حسين
# بەهاری هەمیشەیی عیراق

کاتێـك کە لە دەروازەی مانگـی ئادارەوە بەرەو پیری بەهاری ڕەنگین دەچیـن و زەوی بەرگـی سەوزو گوڵگـوڵین دەپۆشێت و گەرموگوڕی چالاکی لە وەرزی جوانی بەهـاردا وەکـو کانی و کانیاوەکانی کوردستان هەڵ دەقـوڵێت، کۆمـەڵێك بۆنـەو ڕۆژانی پڕ لە بایـەخی ئەم مانگـە لە لاپەڕەی مێژووی وڵاتەکەمان دا دەخوێنینەوە.

ئەم بۆنـەو جەژنـانەش زیاتر ئەمساڵ مایەی خۆشی و بەختیارین چونکە ڕۆژگـاری ئاشتی دا دەستـەملانی ئاسوی بەرزی وڵات دەکەن. . ئەو ئاشتی یـەی کە سەرکـەوتن بەسـەر دوژمـنی کۆنـەپـەرستی داخ لەدڵی دەسـت درێـژکـەردا دوای بەرگری یەکی قارەمانانەی ڕۆڵەکانی گەل هێنایەدی.

جا لەم مانـگـەدا ئەم نیـشـانـە پڕشنگدارانەمان بەرچاو دەکەوێت:

## جەژنی ئافرەتانی عیراق

ڕۆژی سـەرەتـای مانـگە جەژنـی مامـۆستـا بوو کە منـداڵانمـان بەزانسـت و بیـری ڕۆشن پەروەردە دەکـەن. هەروەها یادی سەرکەوتنی عیـراق بوو بەسـەر کۆمـپـانیـا نەوتـی یـەکـان دا کە خۆمـاڵـی کردنەکەی نەوت سەربەرزانە ئاڵای سەرکەوتنی بەرزکردەوە.

لە چواری مانگیش دا جەژنی ئەو ڕوو سوورە عیـراقیـانـە بوو کە بە ڕۆڵـەو براو مێـرد و باوك و بە پارەو بەزێـر لە پێنـاوی نیـشتمـان دا قوربـانیـان دا. . ئاهـەنـگ گێرانی ئافـرەتانی عیراق لەم ڕۆژەدا و لەژێر سێبـەری باڵی ئاشتی دا ئاهـەنگێکی تایبەتی بوو، ئافرەت شانازی بەوەوە دەکـات کەوا سـەرۆکـی بەڕێـز پیـرۆزبـایی یـەکی گەرمی پێشکەش کردو شانازی بەوەوە کرد کە توانی لە ڕۆژانـی شەڕدا چەرخی بەرهـەم هێنـان بخاتە گەڕو ڕۆڵەکانی لەسەر خۆشـەویـستیی نیـشـتمـان و پارێـزگـاریی نیشتمانڕابهێنێت. . جـەژنی ئەم جارەشی ڕێکـەوتی یادی بیسـت سـاڵـەی دامـەزرانـدنی یەکێتی ئافرەتانی عیراق دەکات، ئەم ڕێکخـراوە میلی یـەی کە بووەتـە زمـان و دڵی ئافرەتانی عیراق هەر لە لوتکەی چیاوەتا دوورترین شوێن لە دەشـتـەکـانـی خوارووەدا، وە توانیـویـەتی دەستکـەوتی زۆر بۆ ئافـرەتـان بەدی بهێنێت کە هەمـوو ئافرەتێکی تر خەونی پێوە دەبینێ.

## دادگە ڕیش جەژنی خۆی هەیە

جەژنێـکـی تری وڵات جەژنـی دادگەری یە کەوا لە سایەی سەرۆکی دادپـەروەردا هەموو ساڵێك ئاهەنگە لە سەرتـانـسـەری وڵات دا دەگێرێت، دوای ئەوەی ڕێنمایی و پشتگیـریی یەکـەم دادپـەروەردا واتا سەرۆکـی بەڕێـز صدام حسین دادگـەریی گەیـانـدە لوتکـەو لە خزمەتی هاونیشتمان و نیشتمان دا داینا.

پاش دوو ڕۆژیش لە جەژنـی دادگـەری ژنـانی جیهـان لە ڕۆژی هەشتی ئاداردا ئاهـەنگیـان گێـراو جەژنی ئافـرەتانی جیهان پێکەوە لەم سەرتـا ئەو سەری جیهـان دا دەنگی دایـەوە، ئەم جەژنـەش جەژنـی خەبـاتی ئافـرەتـان دەگـەیەنێ کە ئافـرەتـان لە کارگـەیەکی ئەمریکادا مانیـان گرت و داوای کرێ و مافی خۆیـان دەکـرد، پاداشـتـی مان گرتنەکـەیـان گوللەو قامچی خاوەن کارگەو سەرمایەداران بوو.

## ١١ی ئاداری بڕیاری مێژوویی

لە ڕۆژی یانـزەی ئاداریش دا ڕۆڵـەکـانی گەلی کوردمـان یادی دەرچوونی بەیـاننامە مێژوویی یەکە دەکـەنـەوە کە نمـوونـەی بەڵێنی مرۆڤانەی حیزب و شۆڕش بوو. بۆ هێنـانـە دیی دیمـوکـراتیـەت و چەسپـانـدنی مافی ڕەوای گەلی کوردمـان لەسایەی یەکێتی یەکی پتـەوی نیشـتمـانیدا. ئەوەبـوو خۆرێیـەری کوردستـان دامـەزراو دامودەزگـاکـانی کەوتە کار. . هەر بۆیـە گەلی کوردمـان بەیـەك دەنـگە بەپیر بانگـەوازی شۆڕشی ١٧ . ٣٠ ئەمـووزەوە هات و قارەمـانـانـی چیاکانی کوردستان لەگەڵ براکانیان لە بەرەکـانی شەڕدا سنگی خۆیـان دایـەبـەر ئاگـری شاڵاوی دوژمن و بەرگرییان لە خاکی پاکی عیراق کرد.

## نەورۆزی بەهارو ئاهەنگ و زەماوەند

کاروانی ڕازاوەی بەهـار ڕۆژ بە ڕۆژ لە عیـراقـی سەربـەرزو خۆشـەویست دا هەنگاو دەنێ بەرەو شادی و جەژن و بەختیـاری تا کە گەیشتینـە (٢١)ی مانـگ، جەژنی نەورۆز لە ئاسـۆی وڵات سەری دەردێنی و هەمـوو ساڵێك سروشتی جوانی کوردستـان خۆی لە ئاوێنەی دڵ و دەروونی ڕۆڵەکانی دا دەنوێنێ.

ئیتـر ڕۆڵـەکـانی عیـراق بە کوردو عەرەبـەوە دەستی یەکتـری دەگرن و شان بەشـان شایی شانازی دەگێڕن و بە دەنگی زوڵاڵ بانگی سەربەستی ئەدەن. . هـاوار دەکـەن بەخێـر بێت نەورۆز! بەخێربێت بەهار لە خاکی بەهاردا، لە نیشتمانی صدام حسین دا کە خۆی بەهـاری هەمیشـەیی هەمـوو عیـراقی یـەکانە، کەوا ئێمە گشتمـان گیـانی خۆمـان دەخـەینە بەردەستی لە پێناوی سەربەرزی ئەو نیـشتمـانـەی کە سەرۆکی بەڕێـز گەیاندی یە لووتکە.

سا ئەی نیشتمـانی بەهـاری ڕەنگین ئەی خاکی صدام حسین، خوا بکـا هەمـوو ڕۆژانت بەهارو جەژن بێت و جەژن لە تۆو لە ڕۆڵـەکـانی گەل پیرۆز بێت.

● ڕێزان ●

# لەماوەی سێ ڕۆژدا



● سەرۆکی فەرماندە صدام حسین خۆی سەرکردایەتی هەڵمەتی ئاوا کردنەوەی شاری بەصرەی گرتە دەست، بۆیە لەم ماوەیەدا چەند جارێك سەری لەبەصرەداو کاروباری جێبەجێ کردنی نەخشەی ئاواکردنەوەی شارەکەی بەسەرکردەوە ، کەوابە پێی ڕێنمایی‌و ڕابەریی سەرۆك تیپی کارو ئاوەدانی وەکوپوورە هەنگ خەریکی ئیش کردنن. لەم سەردانانەش دا وەزیری بەرگری بەڕێز عدنان خیراللەو وەزیری پیشەسازیی سوپایی بەڕێز حسین کامل هاوڕێی بوون . جارێکیش خێزانی پایە بلندیان لەگەڵ دابوو کە نوێژی نیوەڕۆیان لە مزگەوتی شاری فاودا کرد. ئەمەجگە لەکۆمەڵێك ئەندازیارو ڕاوێژکاری ئەندازەییش بە هاوڕێیەتی سەرۆکی بەڕێز شادمان بوون . سەرۆکی فەرماندە داوای گەلە کۆمەکی هەموولایەنەکانی کردووە بۆ ئاواکردنەوەی بەصرەو ماوەی سێ مانگیشی بۆ بەجێ هێنانی پرۆژەکە داناوە .

●سەرۆکی فەرماندەرۆژی ٢٤ی شوبات لەشاری بەصرە دیدەنیی ئەدوارد شیفرنادزەی وەزیری دەرەوەی یەکێتی سۆڤیەتی کردو نامەیەکی دەستخەتیشی لێ وەرگرت کەمیخائیل گۆرباچۆڤ ئەمینداری گشتی حیزبی شیوعیی سۆڤیەتی‌و سەرۆکی ئەنجومەنی بەرزی سۆڤیتی بۆی ناردبوو. لەم دیدەنییەدا پێوەندیی دوو قۆڵیی نێوان هەردوو وڵات و ئارەزووی تەواوی پەرەپێدانی لە هەموو بوارێك دا باس کرا .

● ڕێکخراوی «پێشکەوتن»ی نێو دەوڵەتی میدالیای شەرەفناکی زێری پێشکەش بە سەرۆکی فەرماندە صدام حسین کرد لە پاداشتی تەقەلای هەمیشەیی ودلسۆزانەی بۆ دۆزینەوەی چارەسەریی ئاشتیانەی کێشەی نێوان عیراق وئێران . ئەم ڕێکخراوەیەش کۆمەڵەیەکی ڕاوێژکاری سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکانە .

● ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش و سەرکردایەتی هەرێمی حیزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالست لەکۆبوونەوەیەکی هاوبەش دا کە سەرۆکی بەڕێز صدام حسین لەڕۆژی ٢٦ی شوبات دا

سەرۆکایەتیی کرد بریاریدا:

- لیژنەیەك بەسەرۆکایەتیی بەڕێز عزة إبراهیم پێك بێت بۆ دانانی گەڵاڵەی دەستووری نوێی وڵات.

- لیژنەیەکی تر بەسەرۆکایەتیی بەڕێز طەیاسین رمضان پێك بێت بۆ دانانی گەڵاڵەی یاسای ڕێك خستنی حیزبایەتی لەوڵات دا بەپێی ئەو ڕێبازو بنەڕەتانەی ئەنجومەن و سەرکردایەتی لە کۆبوونەوەکانی پێشویان دا وتوویژیان لەسەرکردووە.

- هەروەها لیژنەیەکیش بە سەرۆکایەتیی لطیف نصیف جاسم وەزیری ڕۆشنبیری وراگەیاندن پێك بێت بۆ ئامادەکردنی پرۆژەی یاسای ڕێك خستنی سەربەستیی ڕۆژنامە نووسی لە هەرێم دا.

● دوای ئەوەی سەرۆکی بەڕێز صدام حسین فەرمانیدا هەرچی ماڵێك لە قور وقامیش دروست کراون لە بەصرە نەهێلرێن و لە جیاتی ئەوە پارچەزەوی بەبێ پارەبەسەر دانیشتوانی ئەو ماڵانەدا دابەش بکرێت و پێشەکیی عیقاری وخەڵاتە پارەیەکی سەرکردەش وەربگرن، چوار لیژنەی تایبەتی پێك هات و دەستیان دابە ناونووس کردنی ئەم ماڵانە. ئەم پاداشتەی سەرۆکی فەرماندەش لە چوارچێوەی کاری ئاواکردنەوەو ڕازاندنەوەی شاری خوگری بەصرەدایە.

● بەپێی ڕێنماییەکانی سەرۆکی فەرماندە صدام حسین، عیراق دەرگای فرۆکەخانەو ئاسمانی خۆی لەبەردەم فرۆکەوانیی جیهان دا کردەوە کەئێستا فرۆکە کانی عەرەب وبیانی دەتوانن بەئاسمانی عیراق دا بەرەو ئێران تێپەربین. لەم ڕووەوە جاردرا کە ئاسمان و فرۆکەخانەکانی وڵات بۆ بەکارهێنانی لایەنی ئابووری کراوەن، فرۆکەخانەی بەصرەش کارئاسانی یەکی تەواو پێش کەش هەر فرۆکەیەك دەکات کە لە وێ دا بنیشێتەوەو وکرێی نیشتنیان لێ وەرناگرێت. فرۆکەخانەی دەوڵەتانەی صدام یش بریاری دا لە سەدادە لە کرێی نیشتنەوە دابشکێنێ.

● ڕۆژی ٢٠ و ٢٢ی شوبات دوو پۆستە دیلە عیراقی یەکان بەژمارەی ١٥٥ کەس لە نەساغەیەك کەوتە هاتنەوە خاکی نیشتیمان. پێشوازی کەریان سکرتیری لیژنەی هەمیشەیی لیقەومانی شەڕو نوێنەری خاچی سووری دەوڵەتانە لە بەغدا بوون.

● بەڕێز طارق عزیز جێگری سەرۆکی وەزیران و وەزیری دەرەوە لە بارەگای وەزارەتی ڕۆشنبیریو ڕاگەیاندن دا کۆنگرەیەکی ڕۆژنامە نوسانەی بەست کەوا بەڕێز لطیف نصیف جاسم وەزیری ڕۆشنبیریو ڕاگەیاندن و سەرۆکی دایەرەکانی ڕاگەیاندن و ڕۆژنامە نووسیو نوێنەرانی بریکاریی هەواڵدەری عیراقیو ئێشگەی ڕادیوو تەلەفزیون و ڕۆژنامەو گۆڤارە خۆماڵییەکان بەشداربوون، لەکۆنگرەکەدا دوورودرێژ باسی ئەنجومەنی هاوکاری عەرەبی چوارقۆڵی کردو گوتی مەبەست لە دامەزراندنی ئەم ئەنجومەنە پەیداکردنی نموونە کاری هاوکاریی بەراستیو کاریگەرەو پتەوکردنی بناغەو ئامانجەکانی جامیعەی دەوڵەتانی عەرەبەو پشتگیریو هەرەوەزیی نێوانیان بەهێزدەکات. هەر وەها گوتی کە سەرکردەکانی ئەنجومەنی هاوکاریی عەرەب سوورن لەسەر هێنانەدیی تەواوو کاریگەری پەیماننامەی دامەزراندنەکەی





● دەستکەوتێکی تازەی ڕۆلەکانی گەل ئەوەبوو کە وەزارەتی پیشەسازیو پیشەسازکردنی سوپایی بریاریدا نرخی تازە بۆ لەکارکردنی وزەی کارەبا دابنێت، ئەمەش لە یەکی مانگی ئادارەوە، بۆئەوەی لەنێوان داهاتی هاو وڵاتان و بەفیرۆ نەدانی وزەدا هاوسەنگی ئەنجام بدرێت. لە ئەنجامی ئەمەش دا دەوڵەت ٥٠٪ی پارەی لەکار کردنی ماڵان لە ئەستۆ دەگرێت.

● دەوڵەتی سویدو نەرویج باڵیوزەکانی خۆیان لە تاران داواکردەوە، بۆ پێشان دانی پرۆتستۆ دژی پێشێل کردنی مافەکانی ئادەمیزاد لەلایەن ڕژێمی ئێرانەوە.

● نەمساو فینلندە نارەزاییان دەربری لەڕووی ئەوکردەوە تیروریستانەی کاربەدەستانی ئێران دەیکەن بەرامبەر بە مافەکانی ئادەمیزاد.

هەر لەبەر هەمان هۆ دەوڵەتانی بازاری هاوبەشی ئەوروپایی ئەوانیش باڵیوزی خۆیان لەئێران کێشایەوە دەوڵەتی بریتانیاش بڵاوی کردەوە کە پێوەندی دیپلوماسی لەگەڵ ئێران دا دەبرێت.

# رۆژێکی تەواو لەگەڵ پارێزگاری هەولێر







## رەنگین .. لەنێوان پارێزگار وهـ

داوای کردبوو، رەنگین ببینێ. کە چوومە ژوورەوە، ژمارە تازەکەم لەبەردەم دانا.. دەستی کرد بەخوێندنەوەی بابەتەکانی. چاوی کەوت بەو لێکۆڵینەوەیەی دەربارەی گیروگرفتی باخچە گشتی‌یەکان نووسیبوومان. وام دەزانی دڵتەنگ دەبێ بەرامبەر بەو کەموو کورتی‌و وێنە تاڵانەی کە بەبێ پرسی ئەو. بڵاومان کردەوە.. کەچی بەوورده زەردەخەنەیەك ووتی:

دەستان خۆش.. !بنووسن. راستی روون کەنەوە، ئەمە هەقیقەتی باخچە گشتی‌یەکانەو، ئێمەش لەگەڵ ئێوە، هەوڵ ئەدەین بێ سنوور کار بکەین بۆنەهێشتنی ئەم وێنەتاڵانە!!.

پێم ووت.. چۆن؟

ووتی: ئێستا وەکو هەست ئەکرێ رووی شارەکە گۆڕاوە. بەڵام خواستی ئێمە لەوە گەورەترە.....!

### . لەگەڵ هاووڵاتیان .

ئەو رۆژە، رۆژی چاوپێکەوتنی هاووڵاتیان بوو. بەژمارە، زیاتر لە (..٢)کەس هاتنە ژوورەوە، بەرێزی بەزەردەخەنەو خۆشەویستی دەیرواندن... ئەگەر شتێك دووریش بوایە لە یاسا.. هەولێ دەدا بۆتێگەیشتنی رووی راستی مەسەلەکە وروون کردنە وە...

ئەو چەند سەعاتەی لە تەکیا دانیشتین.. زۆربەی بابەتەکان پەیوەندی بەزەویەوە هەبوو... لەوانەش.. هاووڵاتیان گولیزارطە، شلێر رشید، محمد مجید، سمیرەعلي، احمد سعید، محمد ولي..

تاد... بەزەردەخەنەوە پێ‌ی دەووتم: وەرە تۆش بێتە شوێنی من.. چۆن ئەتوانم لە سنووری راستی دەرچم..! مەسەلەکە هەقی‌ونا هەقی‌یە... بەمن وا بێت ئێستا هەموو هەولێر خاوەن ئەرزو خانووبێت.. خۆشت دەزانی.. هەرتەنیا ئە ماڵ چەند هەزار پارچە زەویمان دابەش کرد!!.

ئەوی راستی بێ.. بەرێزی لەبەردەم هەندێ سکاڵا دائەماو زۆر بیری ئەکردەوە.. خۆشترین پرسیاریشی ئەوەبو کە پێ‌ی دەووتم: تۆچی‌ئەڵێ‌ی؟

### . هاتووم بوکەکەم رازی‌کەم .

خاتوورمزیة احمد.. یەکێك بوو لە وانەی هاتە ژووره وە.. باسی کێشەیەکی کرد کە پەیوەندی بەماڵ دانانی بووکەکەیەو هەبوو پێویستی‌یەکانی خستە بەردەم بەرێز پارێزگاری هەولێر.. ئەویش بەزەردەخەنەوە ووتی.. مادام







# ـساووڵاتیان دا * داخوازییەکانی خەڵکی، لەڕێی ڕەنگینەوە.



## سەردانێکی شار و چارەسەرکردنی هەندێ دیاردە

مەسەلە بوکەکەتە فەرموبوم نووسی . . برۆ شتەکان وەرگرە!

### . جەنابت کێ ی؟.

هاووڵاتیەك، تەمەنی نزیکەی ٦سال دەبوو . یەکەم جاربوو بێتە پارێزگا . نەیدەزانی ئەم و ئەوکێیە . تەنیا ئەوە نەبێ . . کە لەبەردەم کابرایەکی گەورەدایە . . ! بە بوڵە بوڵێکەوە پرسی . . باشە . . توکێی؟

جەنابی پارێزگاریش:

خاڵومن . . ! موحافیزم . . فەرموو!

داوکەی خستە بەردەمی . . .

دووبارە پرسیەوە:

بو کێی بیەم؟

بەرێز: بەرێوەبەری شارەوانی ئەو کارەت ئەنجام دەدا .

### . بادابمە زرێ .

یەکێك لەو هاووڵاتیانە، . . نوقستانیك بوو . . بەڵام زۆر بەباوەر بەخوبوون هاتە پێشەوە وتەوقەیەکی گەرمی لەگەڵ بەرێزی کرد . .

بە ئاسپایی هەڵیدای: من تورکی و کوردی و ئینگلیزی دەزانم . . . بەڵام چیبکەم شەلەم!!

بەرێزی :- چیت ئەوێ؟

هاووڵاتیەکە: دام مەزرێنە!

بەرێزی: ئەوا . . داتم مەزراند!! .

### . ئاووزێراب .

بەرێزی پێی خوش بوو، کە هاووڵاتی محمد چاپوك ، سکاڵای ئاووزێرابی خستە بەردەمی . . لە داواکەی کوڵیەوەو تەلەفونی بو بەرێوەبەری زێراب کرد بو چارەسەرکردن .

### . دەرچوونێك بوشار .

ژمارەی هاووڵاتیان زۆرتر بوو . ناتوانم لێرە سەر جەمی شتەکان بنووسم . دەرچووین . کە دەستمان بەگەشتەکە کرد لێم پرسی . . ئەرێ ماموستا هیلاك نەبووی؟

دەیوت: نەخێر . مادام مەسەلە پەیوەندی بەخەمی خەڵکەوە هەیە! . زیاتر ووتی . . خوت گوێت گرت زۆربەیان پەیوەندی بەزەویەوە هەیە . . بەڵام ئاگادارن کەتەنیالە

١٩٨٨ دا ژمارەی پارچە زەوییەکان تەنیا بو هاووڵاتیان گەیشتە ٢١٤٨ پارچە زەوی . . جگەلە شەهیدو ئەوانی‌تر .

### . کێشەی ئاو .

بەدرێژی باسی گەڕەکە بێ ئاوەکانم بوکرد . . لەوانەش لەگەڵیا چووینە گەڕەکی شەهیدان و گەڕەکی سێتاقان . . لە لای خوی وورد ووردشتەکانی نووسیەوە . . ووتی: پروژیەکی گەورە لەم بارەوەلە ئارادایە . . بەڵام ئەوانی‌تر بەرێوەیە . . نەخشە وایە کە کێشەی ئاو بەتەواوی بن بڕ بکەین . . هەندێ لەو گەڕەکانە کە ئاویان ناگاتێ ، هەوڵ ئەدەین بە ئوتوموبیلی ئاو بیان گەیەنین پێ یان لەپێیان . . بەڵام بادڵنیابن کە مەسەلەکە تەنیا وەختە!

### - قیرتاو کردن -

لەگەڵ بەرێزیدا، سەرمان دایە هەندێ ڕێ وبانیوا کە هێشتا دەستی خزمەتگوزاری بەتەواوی نەگە یشتوتێ . . شوێنەکانم بو بەرێزی دەست نیشان کرد . . بەدەم ڕێگاوە فەرمووی:

هەوڵێکی گەورە لەم بارەوەش لە ئارادایە . . ئەگەر بێت و بەووردی تەماشای شەقامەکان بکەین، هەست بەم ڕاستیە ئەکەین . . لەوەش دیارتر، بڕیارمان



# چۆن شاعیر

## احمد سلیمان الاحمد

## بیرلە ئەدەبی کوردی دەکاتەوە



# کێشەی ئاو وکارەباو...شتی‌تر!

داوە کە ئەمساڵ هیچ شارۆچکەیەك لەرێگای قیرتاوکراو بێ بەش نەکەین.

**- باخچەکان -**

چووینە باخچە گشتی یەکان.. لەوانەش باخچەی گڵکەند.. هەندێ خاڵمان دەست نیشان کرد.. بەرێزی لەم بارەوە ووتی: ئەمساڵ هەڵمەتێکی گەورە بۆئەم مەبەستە ساز کراوە.. ئەوەی ئێوە لە رەنگین نووسیووتان پێش ئەم هەڵمەتەیە.. تەنیا لە نێوەندی شەقامەکانی سەر ڕێ چاندن گەیشتۆتە ٤٥/٢کم. ڕێگای هەولێر - مووسڵ بەدرێژایی (٨) کم و چاندنی(...٣)سێ هەزار شەتڵ.

**رەنگین بەڵام هەندێ لە وانە ئاویان ناگاتێ‌و ووشك دەبن!**

بەرێزی: ئەمساڵ کۆتایی بەم مەسەلەیە دێ..!

**- پرۆژەی قەڵا بەلام -**

پێمان ووت.. مامۆستا گیان.. ئەوەتاقەڵاو، ئەوەتانێ پرۆژەی پێشکەوتنی !!.

بەرێزی ووتی: ئەگەر مەبەستان لە پرۆژەکەیە.. ئەبێ ئەوەبزانین کە زۆر شوێنی کەلە پووری تێدا زیندوو کراوەوە.. تەنیا شورەکانی گەیشتە ١٦٠م(٢) و دروست کردنی دیواری ٤ مەترو، کەڵك وەرگرتن لە هەندێ خانووە کۆنەکان وتازە بوونە وەیان (هەندێ پێشنیارمان خستە بەردەمی کە پەیوەندی بەهەندێ لایەنی قەلاوەهەیە

**- تەلەفۆن -**

**رەنگین: ئەوەی راستی بێ.. هاوولاتیان زۆر گلەیی یان لە دەزگای تەلەفۆن هەیە..!**

بەرێز: نەخشەمان وایە کە بەداڵەیەکی نوێ دابمەزرێ.. کە بریتی یە لە ١٧ هەزار.. بەداڵەی (شۆرش)بەردەوامە بۆ بەجێ هێنان.. جگە لەوەی کە ئەم بەداڵەیە دەگۆرین بە ئەلەکترۆن.

**- ئاو..دیسان ئاو -**

کێشەی ئاومان وەکو ژمارەو.. پێو یستی لە راپورتێکدا خستە بەردەم بەرێزی...

بەرێزی ووتی: هەرهێندەت پێ دەڵێم.. ئێستا بەرێوەبەرایەتی ئاووزێراب بەتوانای (هەشت ملیۆن)گالۆن خزمەتی هاوولاتیان دەکات.. بەلام پرۆژەیەکی زۆر گەورە هەیە و دەبێ هاوولاتیان چاوەراونی بکەن.

**- ڕێگای هەولێرو شارەکان -**

بەرێزی خۆی دەست نیشانی ئەوەی کرد کە کۆمەڵێك پێشنیار لەم بارەوە پێش کەش کراوە کە ئەمساڵ هیوادار ین پێبەدی..

**- پێش کۆتایی -**

زۆر شت لەگەڵ شتەکەدا رووبە روومان بۆوە.. تاوناتاوێ بەرێزی گوێی لە پێشنیارەکانمان دەگرت.. پێشنیارەکان پەیوەندی بە ئاووکارەباو زێراب و کێشەی هاوولاتیانەوە هەبوو.. مایەی خۆشحاڵی یە کە زۆربەیانی بەجێ هێنا...!!سوپاس.

■ شێرزاد عبدالرحمن ■

# گۆڤاری ڕەنگین لەڕوی هونەرییەوە گەلێ چاك و پێشکەوتووە...!

ئاخوتن لەگەڵ نوسەران بە تایبەتی هوزانڤانان تام و چێژەکی تایبەتی هەیە ئەخاسمە ئەگەر لەگەڵ کەسێك دا بێت کە هەستی ئارامی و خۆشی لەگەڵ دا بکەیت و بزانیت ئەوەی بەرامبەرت حەزی لە میللەت و کەلەپوری تۆیە بە بێ هیچ بەرژەوەندییەك.. ئەم شتە لەلام روون و ئاشکرابوو پێش ئەوەی بچمە لای هوزانڤانی عارەبی سوری «أحمد سلیمان الأحمد» بەبێ ئەوەی هیچ پرسیارێك ئامادە بکەم کەچی گەلێك پرسیار لە دانیشتنەکەدا ئامادەبوون.. لە دەست پێ کردندا گوتم:

پرسیارەکانمان بە وێنەیەکی کلاسی ئەنجام نادەین وبڵێین کەی لەدایك بووی و چەند نوسینت هەیە و کەی دەستت پێکردووەو چۆن و کەی و بۆ..؟! نەخێر چونکە هەموو ئەم زانیارییانە لە ناميلكە تایبەتییەی خەلاتی «صدام» بۆویژە چاپکراوەدا هەنە... بەلام ئەوەی لەبەر چاوە کە یەکەم نوسینێ بلاوت کردووتەوە شانۆنامەی «مەم وزینە» «مەم وزین» مەزنترین مەلحەمەو داستانی کەلەپوری میللەتی کوردمانە.. لێرەدا دەتوانم لێت بپرسم.. ئەم پەیوەندییە هونەری و داهێنانەی ئێوە لە گەڵ کەلەپوری کوردیدا کەی و بۆ ڕووداوەو مەم وزین چۆن هاتە بەرهەم..؟

وەلام ـ بە وێنەیەکی گشتی من گەلێ گرینگی بە کەلەپوری مرۆڤایەتی دەدەم و ئەوەی ڕەسەن بێت دەمهەژێنێ و ڕامدەچلەکێنێ و کارێکی مەزنم تێ دەکات ئەخاسمە ئەگەر لە ناو کۆمەڵێك دا ڕەسەن و جێگیر بێت و تایبەتی و کەسایەتی میللەت تێیدا بەدی بکرێن... ئەوەبوو وای لێکردم کەبە سەرسورمان و بەختیارییەوە خۆم ببینم لەو کاتەی دەقەکەی مەم و زینم دیت و بڕیام دا بەوێنەیەکی هونەری و داهێنانەوە بگوێزمە سەر زمانی خۆم کە زمانی عارەبییە.. هەر وەها لەو کاتەدا شانۆنامەی هوزانی گەلێك پێشکەوتبوو. چەرخی زێرینی شانۆنامەی هوزانیبوو.. شاسواری ئەم مەیدانەش هوزانڤان «أحمد شوقي» بوو... هەر وەها هیڤی و ئومێدی گەنجی و خودەرێنانی تولازی وەسا کاری تێکردم و هانیدام کە شانۆنامەی مەم و زین بهۆنمەوە.. ئەوەی شیاوی باسە لە کاتی دەرچوونی ئەم شانۆنامەیە گەلێك لە ڕەخنەگرانی عەرەب وایان دادەنا کە ئەگەر شانۆنامەی «مەم وزین» لەشانۆنامەکانی «شوقی»چاکتر نەبێت هیچ کاتێك لە وان کەمتر نی یە.. لەو ڕەخنەگرانەش «سهیل ادریس» لە گۆڤاری «الصیاد» ئەم ڕایەی هەبوو.

● سەیدا ئەو سەر چاوانەی ئەم شانۆنامە هوزانییەت لێوەرگرت چۆن بە دەستت کەوتن و کەی هانیان دای بۆ ئەوەی ئەم کارە ئەنجام بدەی..؟!

ـ لە دەوروبەری سالی ١٩٤٥ تەماشای هێندەك لەژمارەکانی گۆڤاری «الرسالە»ی میسریم دەکرد کە سەر نوسەری «أحمد حسن الزیات»بوو. چاوم بە وتارێکی مامۆستا«عبدالمسیح وزیر»کەوت.. ئەویش یەکەك بوو لە نوسەرە بە ناوبانگەکانی عیراق و داستانی «مەم و زینی»وەردەگێرا زمانی عارەبی و پوختەکەی لەم گۆڤارەدا بلاودەکردەوە بەو ناوەی کە ئەم دەقە دەقێکی کەلەپوری کوردییە لە عیراق دا... هەر وەها داوا لە هوزانڤانەکی مەزنی عارەب دەکرد کە بە هوزان بهۆنێتەوە، چ بە وێنەی داستان یان ژی بە وێنەی شانۆنامە لە سەر شەکلی «مجنون لیلی»ی «أحمد شوقي» مێژووی گۆڤارەکە سالی ١٩٤٢ بوو. کەچی من لە دەوروبەری سالی ١٩٤٥ چاوم بەم دەقە کەوت. لێرەدا من دوو دڵ بووم لەم کارەدا چونکە وام بیردەکردەوە. نەك یەکێکی تر لە هوزانڤانانی عارەب بەم کارە هەڵستابێ لە پێش من.. بەلام کارتێکردنی ئەم دەقە کەلەپورییە ئەو هێندە خەست و توند بوو لە سەر بیر و هۆشم دا تا وای لێ کردم کە خامەو کاغەزی خۆم هەڵگرم و بگەڕێمەوە گوندەکەی خۆم و بۆ ماوەیەکی چاك لە وێ مامەوەو دەرسەم تەواوکردو گەڕامەوە بۆ دیمەشق و نوسینەکەم بۆ هێندەك برادەرانم خوێندەوەو بە چاکیان زانی و هانیان دام هەر لە عەینی سالدا واتە سالی ١٩٤٥ لە چاپی بدەم. پاش ئەوەش گەلێك جار هەولم داوە دووبارە چاو پێدا بخشێنم و پێدا بچمەوەو هێندەك گۆڕانی تێدا ئەنجام بدەم و لە چاپی بدەمەوە لێ پاش چل سال واتە لە سالی ١٩٨٥ ماوەم پەیداکرد کە دووبارە بهۆنیمەوەو بە وێنەو شەکلەکی نوێ ئامادەکەم بۆچاپ.. دیسان نابێ لە بیرم بچێت کە لە کاتی خۆیدا لەو کاتەی «مەم و زین سالی ١٩٤٥ لەچاپ درا هێندەك لە نوسەرانی عیراق پیرۆزباییان لێ کردم لە دەرچوونی ئەم شانۆنامەیەو کاغەزیان نارد. لەوانە هوزانڤانی عیراقی خاتون«لمیعە عباس عمارە»کەپە نجەی بۆ چەند دێرەکی ئەم شانۆنامەی ڕاکیشابوو.

● ئەری ئەم کارە هونەرییەی کەلە پوری کوردی واتە«مەم وزین» هیچ تەئسیر و کارتێکردنێکی هەبوو لە مەیدانی داهێنانی تۆدا پاش ئەوەی شانۆنامەی مەم و زینت تەواو کرد..؟!

ـ لە ڕاستیدا ئەم دەقە کەلەپورییە هانیدام کە بەردەوام بم لە مەودای شانۆنامە نوسیندا... لە پاش «مەم



**شانۆنامەی «مەم وزین» یەکەم بەرهەمی ئەم ئەدیبە عارەبیە**

وزین» دەقێکی‌تر کەلەپوری عارەبی لە عیراق هە ڵم بژارد .. دەقەکەش هی کاتی خەلیفە«المأمون»ی عەباسی بوو کە باسی سترانبێژی ناسراوی ئەو کاتەکە ناوی خاتوە غەریبە» بوو. مەئمون ناوی خۆی دانی و لە دوایی‌دا بە «مأمونیە»ناسرا:

● چ هۆیەك بوو وای لیٚ‌کردی دووبارە بە دەقی شانۆنامەی «مەم وزین»دا بچی‌یەوەو بە وێنەو شەکلەکی نوێ داریژی‌یەوە..؟

- هۆی دووبارە گەرانەوەم بۆ داریژتنی شانۆنامەی «مەم و زین» بە وێنەیەکی نوێ ئەوەبوو کە لەم دوایی‌یەدا خۆت دوو دەقی عارەبی «مەمی ئالان»ت بۆ ناردم کە لە عیراق دا لە چاپدراون یەکەمیان هی«د. عز الدین مصطفى رسول» ودووەمیان هی«د. بدرخان السندی» بوو. بەچاکی خوێندمەوەو سودو قازانجێکی چاکم لیٚ وەرگرت و ئاسمانی خەیالی شانۆنامەکەمی پیٚ فرەهۆ مەزن بوو. بەلاّم «مەم وزین»ی «محمد سعيد رمضان البوطي»کە لە دەقی ئەصلی ئەحمەدی خانی وەریگێراوە سەر زمانی عارەبی بەچاکی خوێندومەتەوەو سودیشم لیٚ‌وەرگرتووە بەلاّم خۆی لە پیشەکی دەقەکەی‌دا بە هەلّەدا چووە، لەو کاتەی پەنجەی بۆ شانۆنامەی «مەم وزین»ی من راکیشاوەو گوتیتی: شانۆنامەکە هی هوزانڤان«بدوی الجبل»ە.. خوالیٚخۆ شبووە«بدوی الجبل»ناوی «محمد»ە و برامە.. بەلاّم شانۆنامەکە من نوسیمە نە وەك برام کەچی سەبدا «محمد سعيد رمضان البوطي» لەم بارەیەوە. بە هەلّەدا چووە.

● ئەری پاش «مەم و زین» و «مأمونیە»وازت لە نوسینی شانۆ هێنا..؟ تەنها خەریکی هوزان مایەوە..؟!

- نەخێر.. هەر وەك لە پیٚش دا گوتم..«مەم و زین» هاندەر بوو بۆ نوسینی دەقی‌تر و بەرهەمی شانۆی هوزانی من کەم نی‌یە.. لیٚ‌یا بەرهەمی هوزان زیاتر زال بوو بە سەر شانۆدا،لە بەر ئەوەی جەماوەر زیاتر تەفاعول لە گەلٚ دەکات و لە بەر چاوەو ئەستیٚرەی شانۆی هوزانیش وەکو رابردوو نابریقیٚتەوە

● سەبدا گیان ئەو دەقانەی لای جەنابت کۆبووینەوەو بیٚ گومان زیاتریش کۆدەبنەوە.. ئەری هیوامان دەگاتە ئەو رادەیەی کە دەقەکان بنە هۆی لەدایك بوونی کاریکی پشکنین«و وتاری ویژەیی لە سەر ئەدەبی کوردی یان هاندەر بۆ کاریکی تری داهێنان لە ئاینەدەی ئەدەبی جەنابت دا...؟

- بەلٚی.. بیٚ گومان.. هەر وەك لەپیٚشداش گوتم گەلیٚك دەقی چاکی ئەدەب و کەلەپوری کوردی لام کۆبوونەتەوەو هیٚندکم خوێندونەتەوەو خەریکی خوێندنی ئەوانەی ترم«هەر وەك رەوشتی خۆم من شت بە وردی دەخوێنمەوە.. هەر وەها ئەوانەی لە ئاینەدەش دا بە دەستم دەگەن و هیوادارم هەر وەك لە مێشکم دا گەلاّلە بووینە لە ئاینەدەدا ببن بە هۆی ئەوەی کاریکی داهێنەرانەی ئەدەبی تیٚدا ئەنجام بدەم..

● کە نوسەرانی کورد زانی‌یان شانۆنامەی مەم و زینت نوسیوە.. بیٚ‌گومان مایەی خۆشی‌یان بوو هیوای هەموومان ئەوەیە کە ئەدیبانی تری عەرەب ئاوریەك لە ئەدەبی کوردی بدەنەوە لە مەودای پشکنین و شی کردنەوە.

- لەباسکردن دا وەك جەنابت. رات چی‌یە بەم هیواو بووچوونی ئەدیبی کورد.. نەك تەنها لەعیراق بەلٚکو لەسەر نەخشەی ولاّتانی عارەبی..؟!

- ئەم شتە هیواو بووچوونیکی ئاسایی‌و سروشتی وپیٚویستە. چونکە مەسەلەکە شتیٚکی پیٚویستە چۆن ئیٚمە هەولٚ دەدەین ئەدەبی خەلکی بیانی بناسین‌وشی کەینەوە. ئەدەبی کوردیش ئەدەبەکەلەگەلٚماندا دەژێت و لە دایك دەبیٚت. لەبەر ئەوە ئەبیٚ ئەدیبی عەرەب بە چاویکی مرۆڤانە تە ماشای ئەدەب و کەلەپوری کوردی بکەن. هەر چەندە ئەم دەرگایە لە زووە کراوەتەوەو منیش یەکیٚکم لە وان و هیوام ئەوە کە ئەدیبانی تری عەرەب ئەم ریٚکایە بە کەمی نەگرن و پیٚدا برۆن بۆ بەرژەوەندی ئەدەب و بەیەکگەیشتنی روشەنبیری مرۆڤایەتی‌و تیٚك گەیشتنی فرەوانتر لەژیٚر سایەی بەرهەمی روشەنبیری مرۆڤانە کە لە سەرەتادا هەمووی - واتە روشەنبیری مرۆڤایەتی - لەیەك سەروچلوە لە دایك دەبیٚت. ئەویش مرۆڤە وبۆمرۆڤ ریٚگاو جیٚگاو بەختیاری پەیدا دەکات.

● چ بە نوسەری کورد دەلیٚیت..؟

- من وەك ئەدیب ونوسەر بە نوسەری کورد دەلیٚم کە ئیٚمە نووسەری یەك ولاّتین و لە یەك خاك دا هەلٚکەوتین و کوششمان هەر بۆ یەك شتە ئەویش بەختیاری مرۆڤە چ کورد یان ژی عارەب هەر وەها بۆ ئەوەی روشەنبیری هەر دوو لا یەکتر بناسن و تیٚکهەل ببن لە مەودای شارستانی یەتی مرۆڤی ئیٚمرۆمان دا. نەبیٚ زیاتر لە یەك و دوو نیٚزیك ببین لە مەودای داهیٚناندا

● رات دەربارەی گۆڤاری رەنگین چی‌یە..؟ کە یەکەم جارە دەیبینی و لە بەر دەستی تۆ دایە..؟

- دیارە گۆڤارەکە لەلای هونەری‌یەوە جوانەو بە چاکی پیٚشکەوتوە. هەر هیٚندەش دەتوانم بلیٚم.. چونکە من تیٚ ناگەم لە بابەتەکانی.. هیوادارم بتوانم تیٚ بگەم پاش ئەوەی فیٚری کوردی ببم...

لە ئاخیردا منیش پیٚم گوت:.. ئیٚمەی کوردیش بە هیوای ئەوەین کە ئەدیب و نووسەرانی عەرەب فیٚری زمانی کوردی ببن و ئاوری‌یەك لە ئەدەب و رۆشەنبیری کوردی بدەنەوە هەر وەك خولیای ئەدەبی میللەتانی ترن.

ئەوەی شیاوی باسە کە« أحمد سليمان الأحمد»ی هوزانڤان لە نیٚوان ١٥ شاعیردا پالیٚورا بۆخەلاّتی «صدام» لەشیعردا. خەلکی ولاّتی سوریایە لەشاری « لاذقیە » لەسالی ١٩٢٦ دا لە دایك بووە. برای ئەدیبی عارەبی ناسراو خوالیٚخۆشبو «بدوی الجبل»ە دوکتورای لە زانکۆی سوربۆن لە «ئەدەب و کۆمەلٚ» هەر وەها دکتورای لەزمان لە زانکۆی موسکۆ وەرگرتووە زیاتر لەچل نوسینی چاپکراوی هەیە لە بابەتی شانۆی هوزانی‌و دیوانی شیعر و باس و شیکردنەوەی هوزان. هەر وەها چەندەها وەرگیٚرانی ئەدەبی بەچاپ گەیاندووە. زیاتر لەو بلاّوکراوانەی لە گۆڤارو رۆژنامەکانی ولاّتانی عارەب بلاّوکردوتەوە

لە رۆژی ١٩٨٨/١/٢٩ خەلاّتی «صدام» لەشیعردا وەرگرت.

● د. نافع ئاکرەیی ●











### کیژیکی هونەرمەندو

# پێشانگای گوڵ و تابلۆی سیرامیك

گوڵ نیشانەی ئەڤینە. نیشانەی هیزە نیشانەی جوانیو پێش کەوتنە، نیشانەی سروشتی رەنگاو رەنگە.

لەگەڵ مرۆڤا کاروانێکی خۆش و درێژی هەیە هەندێ کەس لە زەمانی کۆندا بڕوایان وابوو کە گوڵ هەمووی سپی بووە بەڵام لەبەر گوناهی حەوا لە شەرما سوور بوونەوە، هەروەها ووتویانە کە گوڵی سپی وسوور چەند باسێکی هەمە جۆری تری لەسەر کراوە.

لە وڵاتی خۆشەویستماندا گەلێ جۆری گوڵ و چەشنی گوڵ هەیە کە بەراستیو بەشێوەیەکی سروشتیو کێوی هەر لە کۆنەوە تاکو ئیستا دەروێن، ئەمەش زۆرترو بەتایبەتی لە کوردستانی عێراق کۆبووەتەوە. بەڵام چاندنی گوڵ بە هۆی مرۆڤەوە دەگەڕێتەوە بۆ ە هەزار ساڵ پێش ئیستا، کۆنترین نوسراو لە جیهاندا لە بارەی گوڵەوە لە عێراق دایەو لە پاشایەتی ئوور دۆزراوەتەوە.

لەم دوایی یەدا هونەرمەندان گرنگی یەکی زۆریان داوە بە پیشان دانی ئەم گوڵانە بە جوانترین شێوە و چەندە پێشانگای هەمە جۆر بۆ گوڵ کراوەتەوە لە بەغداو پارێزگاکانی تردا.

یەکێ لەو پێشەنگایانە پێشەنگای کیژە کوردیکی تازە پێ گەیشتووی کوردە کە دەستێکی هونەری جوانی هەیە لەم کارەدا ئەویش لە سیرامیکداو ئەم کیژە کوردەش ناوی (سوزان هلال عبدالرحیم)ە لە سوزان ئەپرسم کە سەرەتاکەی لەگەڵ سیرامیك چۆن بوە.

- ئەڵێ دەمیگە حەز بەم کارە ئەکەم بەرە بەرە هەوڵم داوە کە نموونەی جوانی گوڵ دروست بکەم تا توانیم یەکەم پێشانگای گوڵی سیرامیك بکەمەوە.

● باشە کێ هاندەرت بوو لەم کارە یان کێ یارمەتی دایت

- لەماڵەوە زۆر یارمەتیو هانیان دام تا بتوانم لەم کارەدا سەرکەوم بەڵام هاندەری راستەقینە شم مامۆستاکەمە کە مامۆستای هونەرمەند (نەجیبە صابر)بووە.

● کەی ئەم پێشانگایەت کردەوە

- پێشانگای گوڵی سیرامیك و تابلۆی سیرامیك لە ئوتێلی بابل اوپرۆی لە بەغدا کرایەوە لە ١٩٨٨/١٢/٢٣ وە بۆ ماوەی چوار رۆژو هەر لەژێر چاودێری مامۆستا نەجیبە صابر بوو.

ئیمەلە کۆتایی ی ئەم چاوپێ کەوتنە لەگەڵ سوزانا هیوادارین هەردەم سەرکەوتوو بیو هیچ کەم تەرخەمی نەکا لە شاد کردنەوەی جەماوەری کورد بەم هونەرە رەنگینە جوانە و زۆر سوپاس.

- منیش سوپاسی گۆڤاری رەنگینی رازاوە ئەکەم لەم چاوپێ کەوتندوا.

● شیرین عباس ●



# بەخۆشی زستان و بەپێکەنینی زاڵم باوەڕ مەکە

لەبەهاری ساڵی ١٩٧٥ دا کۆمپانیای «ئوتوگەلی» کەدروستکەری کارگەی پێڵاوی پلاستیکە لە ئیتالیا، بەو بۆنەیەوە منیش خاوەنی کارگەیەکی ـ پێڵاوی پلاستیکم دەعوەتنامەیەکیان بۆ ناردم بچم بۆ پیشانگای پیشەسازی لە قاهیرە کەلە ١٩٧٥/٣/١٥ دا ئەکرایەوەو کۆمپانیاکە خۆی بەشداری تیاکردبوو ئەیویست منیش بچم بەرهەمەتازەکانی بینم منیش لەکاتی خۆیا چووم. جاهەر کەلە فرۆکەخانەی قاهرە دابەزیم. تاسێ هات بەسەرما چەنان قاهیرەی لەوەپێشی بیرەوەریم هاتەوە بەرچاو قاهیرەی فیرعەونان و هەرەمەکان... قاهیرەی بەرهەڵستی پاڵەوانانەی هێرشە سێ قۆڵیە نارەواکەی ساڵی ١٩٥٦. قاهیرەی بەرپانی ئەسوان و نوکەندی سوێس قاهیرەی هونەرمەندانی ئاواز و مۆسیقاو دەنگ خۆشان. قاهیرەی ئەدەب و ئەدیبانی مرۆڤ پەروەر. قاهیرەی شانۆو سینەماو ئەکتەرە بەرزەکان و چەنا قاهیرەی تریش.

لەگەشتەکەما فرسەتم هێناو سەرم لە زۆر شوێنی پیرۆز داو زۆرم لەو مرۆڤە ئاودارنە بینیو بەدیداریان شادبووم و لەگەڵیان دووام و ـ وێنەم گرت. ئەوەی کە زۆرکاری تێ‌کردم و لەیادم دەرناچێ ئەو گفتو ـ گۆ خۆشانەبوو کە سازم کرد لەگەڵ ئەمری بەڕێزو ئەکتەری بەرزو ـ بڵند «محمود مليجی» لەماڵی خۆیانا من گەڵێك پرسیارم لێ‌کردو ئەویش زۆر بەروویەکی خۆشەوە وەڵامی دامەوە.

ئەمەش هەندێك لەو پرسیارو وەڵامانەیە کەلێم پرسی:

ـ ئێوەی بەڕێز لەکام شاری میسردا لەدایك بوون؟

* لەمیسر لەدایك نەبووم، بەڵکو لەشاری «دیار بەکر»ی ناو تورکیا هاتوومەتە دنیاوە. منداڵ بووم باوکودایکم هاتوونەتە میسرو تیایا نیشتەجێ بوون و منیش بووم بە میسری.

ـ جا خۆ شاری دیاربەکر هەموویان کوردن.

* ئێ.. وایە منیش کوردم و کوردزادەم.

ـ هەمیشە لە فلیمەکانتا دە وری تاوانکاری وەرئەگری بۆ؟

* چونکە ئەوەندە رقم لە تاوانکارە ئەمەوێ تاوان و تاوانکار وەك و چەتە ولێکی ئەهرەمەنانە بخەمەپێش چاوی مرۆڤ تا بزانن بەدیمەن و ناوەرۆك چەند نەگریس و پیس و نالەبارن، بۆ ئەوەی ئەوانیش بەبێ رەحمانە لە دڵی خۆیان بیان سوتێنن و بیان کەن بەخۆڵە مێش.

ـ ئایا ئەزانی بەو دەورەتەوە مرۆڤ رقی لێتەو کەس خۆشی ناوێت؟

* زۆر باش ئەزانم و هەربەوەش شادمان و بەختەوەرم هەر ئەوەشە ئاواتم کە جەماوەر رقی لێم بێ.

ـ ئەوە چۆن ئاواتێکە کەخەڵکی خۆشیانەوێت و رقیان لێت بێت؟

* (بەپێکەنینێکی ساودەی پڕ لە دڵپاکی یەوەو بەروویەکی خۆش و بێ‌گرێوە وتی:ـ

* باڵەسەر ئەمە بەسەر هاتێکی کورتی خۆمت بۆ بگێرمەوە:ـ

(وا تازە دەستگیرانم نیشانە کردووەو زۆری بیر ئەکەم. هەوای خۆشەویستی هەڵی‌گرتم. بچم دیدەنیکی بکەم. هاتم جوانترین دەستە ـ جلم لەبەرکردو بەباشی خۆمم رازاندەوەو رووەو ماڵێ یاری خۆشەویست ملم نا، ماڵەکەیان بەریکەوت کەو تبووەناو پێچی کوڵانەکانی ـ قاهیرەی کۆنەوە، کوڵانەو کوڵان کوتام تا پێچێکی مابوو بگەمە نزیك ماڵی خۆشەویستەکەم بەدیداری شادبم. هەر ئەوندەم زانی لە پڕا ئافرەتێکی قەیرە لە ماڵێکەوە هاتە دەرەوە بەرامبەرم هەر کە چاوی بەمن کەوت شڵەژاو بەدەنگێکی بەرز هاواری کردو قیژانی ووتی:

خەڵکینە وەرن ئەمە تاوانبارەکەی شەوێیە.

هەر کەوای وت خەڵکەکە وروژان کاتێ. بەخۆم زانی لە نهۆمی دووهەمی خانوویەکی تەنیشتمەوە یەك تەنەکە چڵکاو وپیسایی کرا بە سەرما کەسەرم هەڵبری ئافرەتێکم دی لە تارمەیەکەوە تەنەکەی بەدستەوە بوو رای‌وەشان ووتی:

دەبرۆ بێ‌خۆ ئەمەیە سزای تاوانباران.

هەر ئەو قسەیەم لەو ئافرەتە بیست هەرچیم بەسەرهاتبو لە بیرم چووەوەو وام زانی خەڵاتێکی گەورەکراوم.

بەسەرسورمانێکەوە قسەکەیم پێ‌بڕیو وتم بۆچی؟ووتی:

* چونکە دەمێك بو حەزم ئەکرد بزانم ئەو دەوری تاوانباریەم چ کارێکی کردوتە سەر دەروونی مرۆڤ، جا لەوەدا بۆم دەرکەوت کە من سەر ـ کەوتووم و مەبەستەکەم بەتەواوی هاتوتەدیو مرۆڤم فیری ئەوەکردووە کە هەست بەوە بکەن و بزانن پێکەنینی تاوان باران زەهری پێوەیەو ـ تیغێکی کوشندەی بەدواوەیە.

منیش وتم ئایا ئەزانی ئەم مەبەستەی تۆ لەلای ئێمە ئامۆژگاریەکی پەندی پێشیناتمانە؟

ووتی: چۆن؟

وتم: پێشینانی کورد ئەڵێن (بەخۆشی زستان و بەپێکەنینی زاڵم باوەڕمەکە)ووتی بەڕاستی جوانە، بەزەردەخەنەیەکەوە ووتی:

جاکێ ئەڵێ هەر ئەم پەندەش نەبوە بەمناڵی کاری تێ کردووم لە دوایی بووە بەم مەبەستە لە دەروونما.

● «عەلی بۆسکانی» ●



# شوانە ئازاکانی ماسای

خێلی ماسای یەکێکە لە خێڵەکانی ناو ئەفەریقا . ئەم خێلە ژیانیان بە زۆری لەسەر بەخێوکردنی مانگایە ، لەبەر ئەوە قوربانی بە گیانی خۆیان دەدەن بۆ پارێزگاری کردنی مانگاکانیان لە شێر و درندەکانی تر بۆیە پیاوەکانی ماسای بە ئازاترین شەرکەر لەقەڵەم دەدرێن .

ئەم خێڵە بە زۆری لە ناوچەیەکی سەوزایی بەرفراوان دا دەژین لە نێوان کینیاو تەنزانیا ، هەندێك لە ئەندامانی ئەم خێڵە بێجگە لە مانگا ، مەڕو بزنیشیان هەیە ، جل وبەرگی ژنەکانیان لە پێستی ئاژاڵ دروست دەکەن ، هەموو پیاوەکانیان قژیان دەتاشن تەنها شەرکەرەکانیان نەبێت کە قژیان بەدرێژی دەهێڵنەوەو پرچی لێ دەهۆننەوە .

کوخەکانیان لەشێوەی شانەی هەنگ دا دروست دەکەن و دەورەکەی بە قوڕو شیاکە سواغ دەدەن بۆ ئەوەی زیاتر پتەوو قایم بێت . ئاین لای ماسای (ڕۆحانی )یە Aminism بروایان وایە کە هەموو شتێك لەم سروشتەدا ڕۆحی تێدایە وە بروایان بەشتی نادیارو شاراوە هەیە لە سروشت دا ، وە بروایان وایە کە هێزێکی گەورە هەیە لەم سروشتەدا حوکمی هەموو شتێك دەکات پێی دەڵین (ئەنکای) .

خەڵکی ماسای دوو دوژمنی سەرەکیان هەیە یەکەمیان مانگادز ، دووەمیان شێر ، شێر هەموو کاتێك مانگاکانیان دەخاتەمەترسی یەوە ، زۆربەی جار پەلاماری مانگاکانیان دەدات بیخوات ، بەڵام خەڵکی ماسای زۆر لەم درندەیە بەتواناترو ئازاترن وە شارەزایی یەکی چاکیان پەیداکردوە لە بەرەنگاری کردن و کوشتنی ، بۆ ئەم مەبەستەش کاتێك شێرێك لە ناوچەکەیان نزیك دەبێتەوە کۆمەڵێك لە شەرکەرەکانیان بە ڕم و قەڵغانەکانیانەوە دەوری دەدەن و لێی دەچنەپێشەوە . یەکێك لەوانە خۆی دەکاتە قوربانی وا لەشێرەکە دەکات پەلاماری بدات ، کاتێك شێرەکە پەلاماری دەدات هەموو ئەوانی تر بە ڕمەکانیانەوە هێرش دەبەنەسەر شێرەکەو دەیکوژن ، بەڵام ئەوەی دەبێتە قوربانی لەم شەرەدا زۆر جار برینەکانی لەشی زۆر بەئێش و ئازار [illegible] زۆر خراپ [illegible] ئەوکەسە .

پەروەردەی کۆمەڵایەتی لای ماسای بەچەند قۆناغێك دا دە[illegible] هەر قۆناغە لە تەمەنێکی د[illegible] کراودا دەبێت کە جودایە لەوی [illegible] بەپێی ئازایەتی و شارەزایی کاتێك یەکێکیان دەبێتە پیاوێکی تەواو شار[illegible] ماقوڵ ڕێزێکی تەواوی لی [illegible]گیری لەلایەن خەڵکەکەوە ئەو کەسانەی دەبنە شوانی مانگاکانیان دەبێت ئازاو لی هاتووبن بو پاراستنی مانگاکانیان لە شیر . خو هەچ کاتیکیش ئەو شوانە مانگایەکی بدزری یا شیر بیخوات . ئەوا مەگەر نەگەرێتەوە بو ناو خیلەکە . ئەگینا بەڵ لیدانی لی دەدەن زور خراپتر لەوەی شیرەکە پەلاماری بدات .

بویە شوانەکانیان زوربەی جار قوربانی بەگیانی خویان دەدەن و پەلاماری شیرەکە دەدەنەو خواردنی ماسای دیاری کراوە بەپیی بروای خویان ماسی و بالندە ناخون چونکە لای ئەوان ئەم گیاندارانە پەیوەندی یان بە خشوکەوە هەیەو خشوکیش لە زەوی دا دەژی و هەچ شتیکیش لە ئاسمان و زەوی یەوە دەرچی لای ئەوان قەدەغەیە . بویە زوربەی خواردنیان لەسەر شیر و گوشتە هەر ئەمەشە وای لی کردون کە مردووەکانیان ناچنە چاڵەوە بەلکو تەرمی مردووەکانیان بە ڕوونی دەر چەور دەکەن و لەو دەشتە فریی دەدەن بو ئەوەی قەل و داڵ و گیاندارەکانی تر بیخوات .

لەگەڵ ئەم دواکەوتنەی ماسای دا هەندیکیان بوونەتە شارستانی و فەرمانبەرن و هەندیکی کەمی تریان بروانامەی زانکویان بە دەست هیناوەو لە نایروبی دەژین .





وەرگیرانی لە ئینگلیزی یەوە
● رشید احمد فتاح ●

# له ئاوێنەی کاریکاتێری "ڕەنگین"دا

لطیف هەڵمەت



بالا کورت و خنجیلانە .
سوک و بزێو ، وردیلانە .
لە باوە شاسوار ،
لە برایم خان،
لە کفری خاوەن
داستان،لە پرچی
کچی خان و مان،
لە ڕەشماڵی گەرمیان و
کوێستان لە
جوانترین دێی
کوردستان
چریکەی مەل،
سرودی هەزاران
هۆنیەوە شیعری
جوان جوان
بۆ گڕی ئاگر بۆ
دایە،"هەڵمەت"
تا دنیا دنیایە
سەربەرزی بۆ
بوەتەمایە .

# جان جاك رۆسۆ و ناسكترین نامەی خۆشەویستی

جان جاك رۆسو Rousseau (١٧١٢ - ١٧٧٨) فەیلە سووف و نووسەری ناوداری فەرەنساو یەکەمین پێشەوای بزووتنەوەی رۆمانتیکی و مژدەبەری شۆڕشی مەزنی فەرەنسا، ڕۆڵەی کابرایەکی سەعاتچی بوو، لەشاری (جنیف)ی وولاتی(سویسره)و، لەو شارەدا لە دایك بووەو تەمەنی منداڵی ولاویتی تێدا بەسەربردووە.
یەکەمین تاقی کردنەوەی خۆشەویستی و دڵداری لەو شارەدا کردووەو، حەزی لە ئافرەتێك کردووە ناوی[ مادام دی‌وارین]بووەو ژیانێکی یەکجار خۆش و بەختەوەری لەگەڵ دا بەسەربردووەو، تا رادەی شێتی ئەو ئافرەتە شۆخەی خۆش ویستووەو، ئەم ڕووداوە پڕ سۆزو خۆشەویستی‌یە کارێکی تەواوی کردۆتە سەر ژیانی ئەدەبی‌ی رۆسۆ لە کابرایەکی پیشەیی‌و سەعاتچی‌یەوە کردوویەتی بە گەورەترین نووسەرو فەیلەسووفی سەردەمی خۆی‌و، لە دوایی‌دا لەبەر هەندێ هۆی تایبەتی، چووە بۆ وولاتی فەرەنساو لەشاری (پاریس)ی پایتەخت نیشتەجێ بووە،[مادام دی وارین]ی خۆشەویستی لە (جنێف)بەجێ هێشتووەو، گەلێك نامەی پڕ سۆزی هەڵچووی دڵداری بۆ ئەو دۆستە خۆشەویستەی خۆی ناردووەو، بە تەواوی کەوتووەتە ناو جیهانێ بێ پایانی ئەدەبی رۆمانسی یەوەو، لە نامەکانی‌دا وەسفێکی وردو جوانی ئەو ژیانە بەختیاری یەی کردووە کە لەماڵی ئەو ئافرەتە جوانەخۆشەویستەی‌دا بەسەری بردووەو، لە کتێبەکەی [پێ‌لێنانەکانی رۆسۆ= الاعترافات]دا، بەشێکی تەواوی بۆ باس و کاریگەری ئەو دڵداری‌و پەیوەندی‌یەی لەگەڵ [ مادام دی وارین]دا تەرخان کردووە.




رۆسۆ لە کتێبە بە نرخەکەی‌دا دەڵێ: «جوانترین و ناسکترین نامەم لە ژیانم دا بۆ دوو ئافرەت نووسیوە!!»یەکەمیان: بۆ دایکم بووەو، لەو کاتەی کە لەبەر زوڵم و زۆر داریی‌ی رژێمی پاشایەتی فەرەنسا هەڵات بووم بۆ ئینگلتەرەو، وەکو ئاوارەو دوور خراوەیەك لە شاری «لەندەن»ی پایتەخت دا دەژیام. لە نامەکانم دا هەموو ئازارو خەم و ئەشکەنجەیەکی ژیانی دوور وولاتیم بۆ دەنووسی‌و، هەستم دەکرد، دەکەوتمە بەر لێشاوی سۆزی خۆشەویستی دایك و نیشتمانەکەم و هەر بەو سۆزەوە وشەکانی نامەکانم دەخستنە سەر کاغەز!!.
دووەمیشیان: ئەو نامانە بوون کەبۆ [ دی وارین]ی دۆستم دەنووسین و دەم ناردن بۆ شاری (جنێف)و هەموو سۆزو ئەندێشەی سەرەڕۆی خۆمم بۆ دەخستە سەر کاغەزو، دەتوانم بڵێم: «ئەو سۆزو خۆشەویستی‌یە بەهێزەم بۆ[ دی وارین]منیان خستە سەر ڕێگەی ئەدەبیات و بیری فەلسەفی!!»
جارێك لە «رۆسۆ»یان پرسی: «چۆن ئەو نامانەت بۆ دایکت و بۆ ئەو دڵدارە عاشقەت دەنووسی؟ لەبەرچی ئەوەندە پڕ جۆشی خۆشەویستین وبە وشەی جوان و دەربرین ومانای ناسك داڕێشراون؟»
لە وەڵام دا«رۆسۆ»ی فەیلەسووف زۆر بە هێمنی و لەسەرەخۆیی یەوە دەڵێ: «لەو کاتەی کە بۆ نامەنووسین دادەنیشم، بەر لە نووسین هیچ نەخشەو پلانێکی پێشەکی بۆ نووسینی نامەکەم دانانێم و کە دەست بە نووسینیش دەکەم جڵەوی بیرو هۆش و ئەندێشەم بۆ لاشعووری ئاگایی شل دەکەم و ئەو سۆزو ئەندیشەیەی کە لەکاتی نووسین دا بە مێشکم دا دێن، ئەوانە تۆمار دەکەم تاکو نامەکەم تەواو دەکەم وکەدەگەمە کۆتاییشی ئەوەم لەبیر دەچێتەوە کە لە سەرەتادا چیم نووسیوە!! بەم پێ‌یە من بەبیرم نایەت ڕۆژێك لە ڕۆژان بەر لە نووسین بیرۆکەو ناوەرۆکی نامەیەکم ئامادەکردبێت و ئنجا نووسی بێتم» ئەم جۆرە نامە نووسینەی [ رۆسۆ] ش وەکو شیعر نووسین وایە، چۆن شاعیر دەکەوێتە بەر لێشاوی سۆزو هەست وئەندێشەو کاریگەریی بێ ئاگایی لە خوڵقاندنی شیعردا، بەتایبەتی لە خوڵقاندنی شیعری رۆمانسی، بۆیە نامەکانی ئەم نووسەرە گەورەیەش وا ناسك بوون چونکە بە هەمان سۆزو ئەندێشەی شاعیری رۆمانسی داڕێشتراون کە خۆیشی پێشەنگێکی گەورەی ئەو ڕیبازەی رۆمانتیکی بووە لە ئەدەبی فەرەنسی دا.

سەرچاوەکان
١ - مجلة العربي الكويتية - العدد ١٤٧ فبراير ١٩٧١، ص١٣٢
٢ - سميرشيخاني - مع الخالدين - بيروت ١٩٥٩ ص ٦٠، ٦١

ئامادەکردنی
● کریم مصطفی شارەزا ●



وێنـەی هەنـدێ لەناودارەکانی هۆزی هەمەوەند



ئەم وینــە لەبــەغـداد لە باخی (ئوممە) لەپە نجاکانداگیراوە

دانیشتوەکان
(١) ئەنوەر محمد ئەمین ئاغا (٢) سلێمانی حمەئاغا(١٩٠٦-١٩٨٦) (٣) عارف ئاغـا لەسـاڵـی ١٩٧٣ کۆچی دوایی کردوە (٤) یونس مەحمـود خضـر (١٩٠٥ - ١٩٥٩)
ڕاوەستاوەکان (١) آحمـد کەریـم بەگ، سالی ١٩٧٣کۆچی دوایی کردوە (٢) صابـر محمـدئـەمین ئاغـا، ساڵی ١٩٧٧ کۆچی دوایی کردوە (٣) محـمـود فەهـمـی هەمەوەند (١٩٢٨ - ١٩٦١)

ئەم وێنەیەمان لەکاك هاشم سەید ئەحـمـەدەوە بۆهـاتـووە.



ئەم وێنـەمـان لە(دیانا) لەکـاك (عـەلی حەمەد)وە بۆهـاتـووە، چۆنـی نووسیوە هەروەهای ئەنوسینەوە.

ڕیزی پێشەوە لەڕاستەوە بۆچەپ!
١و٢ نەنـاسـراون، سەید حەسـەن تەنکـە، شێخ علاء الدین نەقشبـەندی، مەلاعەلی کانـیمـارانـی، مەلا شێـخ ئەحـمـەد، خدراغـای ئالان، میرزارەشید جهانگیر، عەولامراد.
ڕیزی پشتەوە لەڕاستەوە بۆچەپ:
مصـطفی گێچە، عەلی ئاغای ڕایات، میرحەمەد، برای سەید حەسـەن، عەلیپـەرچـەم، حەسـەن مل قاز، وەستا عەلی ڕایاتی، صوفی رەحمان خەڵان، شوێن - خەڵان .خەڵات خەڵات.

# جهێ سەرهلدانا سترانا کوردی یا کەڤن

دەمێ مروڤ دنێریتە دیروکا سترانا کوردی دێ بینیت کو ئەو یادویر نینە ژوان رویدانێت پەیدابووین لناڤ ملەتیدا بەلکو داخباریەکا مەزن یا لەسەر هاتیەکرن ئو ییت بوینە ئەگەر بو پالدانا سترانبێژی سترانێ بێژیت وەکو [ شەرێ تیاریا، کوشتنا کامبلانی ب دەستێ سەلیمێ مستێ، شەرێ گەلیێ مزویری شەرێت شێخ مەحمود دگەل ئینگلیزی و یێت سمکوی شکاك دگەل عەجەما و شەرێت خانێ لەپ زێرین دگەل شاهـ عەباسی ئو زیرەکی و مێرخاسیا عەمێ گوزی و چەتوی . . هتد ل ڤیرێ دڤێت ئەم راستیەکێ ژبیر نەکەین ئو بو دیروکێ بێژین کو ل کەڤن دا سترانا کوردی جهێ خوکربوو ل کوچك و دایوانخانا و ئەو جهـ بتنێ بیو جهێ بەلاڤەکرنا سترانا چونکو ملەتی و خەلکی ب چاڤەکێ نزم بەرێ خوددا سترانبێژا ئو دگوتی «دەلی» ئەڤ پەیڤە گەلەکا کریتە لناڤ ملەتیداڤەو ل کوچك و دیوانخانا ژی هەمی سترانا جهێ خو نەبوو بەلکو هندەکا بتنێ جهێ خو هەبو ئەوژی سترانێت مێرخاسیێ ییت قەهرەمانیێ و زیرەکیێ ئو پێ گوتن و شانازی کرن ب ئاغاو بەگا ئەڤەژی ژبەر گرێدانا ملەتی ب هندەك رەوشت و تیتالاڤە ئو ژیانا کوردەواریێ و بەلاڤەبوونا نەخویندەواریێ و دگەل ڤەمانا ملەتی ژهەمی لایاڤە نەخاسمە ژلایێ رەوشەنبیریێ ئەڤە هەمی بوونە ئەگەر بو نەبەلاڤەکرنا لاییت دی ییت سترانێ نەخاسمە سترانێت ئەڤینی و دلداریێ . .

بەلێ راستە سترانا ئەڤینێ یا بەلاڤە دناڤ ملەتێمەدا لێ ئەڤی رەنگێ سترانێ جهێ خو هەبوو ل دەمێ «شەڤەروکاو دستار هێرانێ» دەمێ گەنج و تولازێت گوندی خرڤە دبوون ل مالەکێ و کچ و کور دگەلێك دمان هەتا درەنگی شەڤێ . . ڤێجا ئەڤ جهە بیوو وەکو کانیەکێ بو ژدایك بونا سترانا ئەڤینیێ . .

هەروەسا سترانا کاری پەیدابوو ل دەمێ کارکرنێ . داکو ئەوێ زەحمەتا دگەهیتە لەشێ وان ژبیر بکەن و خەمێت خو ب داریژن و دلێ خو خوش بکەن . وەکو چوونا مازی یا وکرنا وان ئو دگەل سترانێت دروینێ . .

ئو سترانێت دەهواتا . دهاتنە گوتن ل دەمێ ژن هینانێ و کەیف خوشیێ . . ئەڤ سترانە دسڤکن و پەیڤێت وان دنازکن هەمی کەس تێدگەهن وزیکا دهێنە ژبەرکرن سترانێت پێ گوتنێ و زێمارو شینیێ ژی هەنە . ئەڤ رەنگێ سترانا دمشەنە لناڤ کومەلگەها مە یاکوردەواری یێ ئەڤە دهاتنە گوتن ل دەمێ ئێك ژمالێ دچوو بەر دلوڤانیا خودێ ڤێجا نەخاسمە هەکە ئەو وێرسێ مالێ با یان ئێکانەبا . .



هوسا هەر رەنگەکێ سترانا کوردی جهەکێ تایبەتی هەبو ئو بو پەیدابوونا سترانێ و پێش کە ڤتنا وێ .

● شعبان مزیری ●








# رعد شهاب:

## ئومێدامن هونەرەکێ پاقژە



دبینی دکورتن. . هزر دکەی کو ڤالانە ژ تەڤ خەم و ڤیغانێت ژینێ لێ دەمێ تێکەلیا ئەڤان مروڤان دکەی هەست ب چەلەنگی‌یەکێ ل جەم وان دکەی. . دبینی داخازا واهیڤی‌و پاشە روژەکا رونترە. . هونەرمەندن. . هونەرێ وان پاقژە دویری جیهانا بازرکانی‌یە. . فەرمانبەرن. کارکەرن ڤێجا ئەم و خویندەڤان دێ سەیرانەکا خوەش کەین ل ناڤ باغچێ ژینێ هونەرمەندێ کومێدی «رعد شهاب»دا بو «رەنگین» بپە یڤت:

- ناڤێ من «رعد شهاب أحمد» ئەز هاتیمە نیاسین ب ناڤێ «رعد الطویل» ل ١٩٦١ من چاڤێ روژێ یێ ماچیکری ل باژێری مویسل. تا نوکە ژی من ژن نەئینایە، فەرمانبەرم ل بزاڤێت قوتابخانا ل باژێری مویسل.

● چنە گرنگترین پشکدارێین تە؟

- من گەلەك پشکداری یێن هەین ژوان[ نوپەرێت. شانوگەرێین سترانکی] ئەڤە «سوق الكوازين» نڤیسینا معد الجبوری، دەرهینانا غانم العبیدی، [عرس مقاتل] ژنڤیسینا خلف راوی - دەرهینانا غانم العبیدي، [ محلتنا، باب الطوب] ئەڤ هەردوکە ژنڤیسینا معد الجبوري بون ژ دەرهینانا راکان العلاف، «السوق»ژدەرهینانا علي احسان الجراح [الحمالە]ژ بەرهەڤکرنا زکی ابراهیم - دەرهینانا غانم العبیدي - ئەڤە ومن گەلەك پشکداری یێت هەین ل تلفزیونێ

● چنە ئارمانجێت تە یێت هونەری؟

- ئەز نەشێم بپەیڤم بەرامبەری ئەڤێ پرسیارێ. . کەرو لال دبم. . چنکی ئارمانجێت من گەلەکن. . گەر ب هەژمێرم دێ من گەهینن دیناتیێ لەوما بێ دەنگ دمینم.

● چنە نیشانێت زارڤەکرێ کومێدی یێ سەرکەفتی؟

- پێتڤی‌یە هەستی سڤك بت و خوین شرین بت. . بەژنەکا زراڤ وەکی بەژنا من لێ بت تا بشێت ب رەنگەکێ خویاو بەرکەفتی ئەو تشتێ بڤێت بگەهینتە جەماورێ دلسوز.

● ئەو تشتێ تە پێش کێش کرێ لدیف ئارمانجێت تەبون؟

- هەلبەت نە. چنکی وەکی من گوتی ئارمانج گەلەکن و ئەگەر ئەز ل پایتەختی بام باوەر بکەن دامن جهێ خویێ تایبەتی هەبیت ل ناڤ بەرا زارڤەکرێت کومێدی‌دا. .

● ئەگەلەك هەڤال ژ کورتا «الاقزام» یێت هەین بوچی بوخو کومە لەکێ نا دانن؟

- براستی ئەم گەلەکین لێ گەلەك ئەگەرێن هەین کو ئەم هەمی پێکڤە نەخربین، چنکی هەر ئێك ژمەیێ مژویلە ب کارێ خو گەلەمن یێ خوشە ئەگەر مە کومەلەك هەبا بو مروڤێت کورت.

● چنە ئومێدو هیڤێت تە و باغچێ ژینێ دا؟

- ئومێدامن. . ئەوە کو ئەز هونەرەکێ پاقژ پێش کێش بکەم





خزمەتەکا خویا بکەت ب رێکا کومێدیەکا ئارمانجبەر نە ب رێکا کومێدیەکا بازرگانی. . ڤێجا داخازا سەرکەفتنێ بو هەمیان دکەم

● روژنامەگەریێ مافێ تە دایەتە؟

- روژنامەگەری - من نانیاست تو دبێژی هێشتا ئەز نەبویمە هەر چەندە کێم وەکی من یێت هەین ئەڤ هەژمارا «شانوگەرییێت» سترانکی»تومارکری بو تلفزیونێ.

● نێزیکترین پشکداری بو دلێ تە کێش کە؟

براستی هەمی نێریکن - ئەو بخو هەستانێت منن. . هەمی ب ئێك رێزن، ڤێجا ئەز نەشێم بەرسڤا ئەڤێ پرسیارێ بدەم

● چەوا سەحدکەیە ئەڤان:

عادل: بابێ کومێدیایە

سعید صالح: ئەز گەلەك حەژێ دکەم

بوسی: جهێ وێ دل و مێلاکن. . ڤیلا جوائێ‌یە

ئەڤینی: گەلەك ب سەهمە

بوهار: وەرزێ ئەڤیندارایە

سولاڤ: نێزیکترین هاڤینگەهە بو دلێ من

پلاتینی: نیسکێ دفروشیت ل «باب الطوب»

رعد شهاب: ستێرەکا گەشە ل ئەسمانێ مویسل

گوڤارا رەنگین: خوشتڤیا مە هەمیانە

● بدل رڤو ●
ژ مویسل



# لەتوێشە بەرەی ژیانەوە

• بە سەرپەرشتی: نوری عەلی ئەمین •



## دیناصۆر چۆن لە ناوچوون؟

مامۆستا جەلال تەقی - ئەندازیار لە دایەرەی ئەشغالی سلێمانی، ئەم باسەی لە رووسی‌یەوە بۆ کردووین بە کوردی:

پێش هەشتا ملیۆن ساڵ سەدەها جۆری «دینا سۆر»لەسەر زەوی ژیاون کە بەسەر «١٤» خێزان دا دابەش بووبوون و لەمانە دوو جۆر «خێزان»یان گۆشت خۆر بوون و ئەوانی تر بەگیاو روەك ژیاون..

لەدوایی دا جۆرو خێزانەکانی«دیناسۆر»بەرەبەرە کەم بوونەتەوە، ئەوەی شیاوی باسە گیا خۆرەکان لە گۆشت خۆرەکان خێراتر لەناو چوون، هەتا لە «٦٥» ملیۆن ساڵ پێش ئێستادا ئەم گیان لەبەرە زەبەلاحە بەجارێك لەناو چووە!..

ئەم لەناوچوونە بەرەبەرەیەو لە دوایی‌دا لەپری‌یە هۆی چی بووە؟

..زۆر لە زانایان رایان وایە کە بەهۆی گۆڕین وساردبوونەوەی ئاووهەواوە بووە، ئەوسا زەوی گەرمتر بووەو بەیەکسانی رووی زەوی گرتۆتەوە، بۆ وێنە، ناوچەی ئالاسکا وەك ناوچەی بەشی ژوور ئێستبوا وابووە، لەگەڵ ئەوەش دا لە ناوچەی هێڵی (٥٠)ی ژووروی زەوی ئێسکێکی زۆری«دیناسۆر» دۆزراوەتەوە، ئەمەش بەڵگەیە کە لەو کاتەدا هێشتا پلەی گەرمایی سەر زەوی شیاوی ژیانیان بووە.

زانایان بیریان بۆ زۆر رووداوی تریش دەچێ کە بوون بەهۆی لەناوبردنی ئەم گیاندارانە، لە هەموویان گرنگتر بەستراو ە بە پەیدابوون و بلاوبوونەوەی چەشنەها گیای نوێ‌و ژەهراوی‌یەوە. لەبەر ئەوەی زۆربەی چەشنەکانی «دیناسۆر»گیاخۆر بوون بەرەبەرە ئەم ژەهرە کاری تێ کردوون. وەك وتمان لەبەرئەوەی هەموویان زۆر گەورە بوون ،یەکەم: زاووزێ‌یان خاوو کەم بووەو درەنگە لەگەڵ ئەو خواردنە تازانەدا راهاتوون.

دووەم: ئەوەندە زۆرخۆر بوون کە رۆژی یەکی «٢٠٠»کیلۆ گیایان خواردوەو بۆ ئەمەش یەکی ساڵی «٢٠٠٠» کیلۆمەتر لەوەرگایان پێویست بووە. دیارە هەموو گۆڕینێك لە جۆری گژوگیادا بەشی ئەم «زۆرخۆرانە»ناکات. هەروەها لەناو:ئەو روەکە تازانەدا تیایاندا بووە زۆر ژەهراوی بووەو کاری کردۆتە خرۆکەکانی خوێن.. هەیان بووە چەشنە«مۆرفین»یکی تێدابووە هەمیشە گێژوورێ کردوون و نەیان توانیوە بەدوای خواردن دا بگەرێن و مردوون، گیای واشی تێدابووە بووە بە هۆی «نەزۆك »بوونیان..

لەمانەش گرنگتر: «٠،٤ - ٠،٥»غرام مادەی «ئەلکالۆید»بەس بوە بۆ ئەوەی «دیناسۆر»بەتەواوی «دەرمان خواردوو»بکات ، دیارە لەو «٢٠٠»کیلۆ گیایەش دا ئەوەندەی ئەم مادە کوشندەیە تێدابووە! پشکنین و لێکۆڵینەوەی زوربەی ئەو پەیکەری ئێسکانەی دۆزراونەتەوە دەریان خستووە کە لە دواکاتەکانی ژیانی «دیناسۆر»دا گۆڕینێکی زۆر بووە لە قەبارەو شێوەی ئەندامەکانی ناو سکیان دا کە لە ئەنجامی تێکەڵاوبوونی «ئەلکالۆید»لەگەڵ خوێن دا رووی داوە ،هەروەك چۆن لەم سەردەمەدا «دی - دی - تی»کاری کردۆتەسەر هێلکەی باڵندەو ناهێڵێ بەتەواوی رەق بین و لە ئەنجام دا هەندێ جۆری باڵندە لەناو چوون.. بەم جۆرە ئەم گیاندارە زەبەلاحە گیاخۆرانە لەناوچوون ..خۆ گۆشت خۆرەکانیان هێندە کەم بوون رەنگە یەکتریان خواردبێ‌و خۆیان قڕکردبێ

## تیشکێك

* خوشکە قەمەرناز بایز ئەم دیاری‌یەی ئافرەتی کورد بۆ ناردوین:

مخابن تا ئێمرۆ ئافرەتانی کورد نەیان توانیوە بە تەواوی جێگەو پایەی خۆیان بگرن و بە ئەرکی سەرشانی مێژوویی خۆیان هەستن لە کارو بەرهەم هێنان و خەبات و ئەدەب و زانست . ئەویش وە نەبێ تەنها سوچ و تاوانی لە ئەستۆی ئەوان دا بێت بەڵکو تاوانباری مەزن نەریتی کۆنەپەرستی‌و پاشماوەی ستەم و جەورە لەسەر بەشی ئافرەتان کە مافی سروشتی و مرۆڤایەتیان لە حەوت پێستی گامێشان رەق هەڵداوە. ئەگەرچی تاك و تەوا هەندێ نموونەی جوان دیارن کە دەنگی نەعرەتەی قارەمانێتیان شان بەشانی پیاوان بەرزکردۆتەوە، وەك حەپسەخانی نەقیب کەلە ١٩٣٠ نامەیەکی دەربارەی مافی نەتەوایەتی گەلی کورد بۆ نەتەوە یەکگرتوەکان بەرێ کرد هەروا توانی قوتابخانەی ئێوارانی کچان لە سلێمانی بۆ یەکەمین جار بکاتەوەو خۆشی بووە قوتابی تیایدا . لەبواری ئەدەبیش دا بەدەگمەن ئافرەتانمان هاتونەتە مەیدانەوە مەگەر تەنها چوار ئافرەت نەبێ کە سواری ئەسپی شیعرو ئەدەب بوون بەڵام بەداخەوە بەرهەم و شوێنەوارەکانیشیان بە شەبۆلەکانی دەریای رۆژگاردا تەربوون وپوکانەوە. لەوانە مەستورەخانم ئەردەڵان و ئامینە خانمی محمد پاشای جاف و حەیران لە ورمێ‌و زینب خانم لە کۆیە.

لە مێژووی هاوچەرخیشمان دا هەندێ ئەستێرەی گەشی روناك لەنێوان ئافرەتان دا دەبینین لە گەڵ سەرهەڵدان و هاتەکۆڕی کچانی خوێندەوارو هۆشیار بۆ کردنەوەی دەزگاکانی ژیان کە خۆشبەختانە مژدەی ئاسۆیەکی سەرکەوتوی تێدا بەدی دەکرێت.

دەسا خوشکان و برایان وەرن دەست لە دەست بەرەو زانست و خەبات و کارو ئازادی بکەوینەرێ تا چیتر کاروانی مێژووی ژیان لە بیابانی نەهات و چۆڵ دا بەجێمان نەهێڵێ.

# له ریگه‌ی گوشه‌کانمان ئیفلیج دوور بخه‌ینه‌وه



نه خۆشی ئیفلیج بوونی منداڵان نەخۆشی‌یەکە تووشی منداڵان دەبێت و لە هەموو تەمەنێك دا ، لەوانەیە ئەو منداڵەی تووشی ئەم نەخۆشی یە دەبێت ژیانی تێك بشکێنێ و پەکی بخات تاوانی چی یە وای لێ بێ هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ دایك چونکە دایك لێپراوی یەکەمە ، لەبەر ئەوە دبێ لە گلێنەی چاوی بیپارێزێ ئیتر بەچاکم زانی سەرێك لە نەخۆشخانەی ابن البلدی منداڵان لە بەغدا بدەم وچاوم بە نۆشدار جلیل بەرزنجی بکەوێت کەوا پسپۆڕی نەخۆشی‌یەکانی منداڵان هەیە . . دایك نی‌یە لە ڕێگای بەرنامە تەلەفزیونی یەکەیەوە نەی‌ناسێتەوە کەوا هەمیشە ئامۆژگاری دایکان دەکات چۆن منداڵەکانیان لە نەخۆشی و مەترسی نەخۆشی‌یەکان دووربخەنەوە ، د عبدالجلیل ٢٩ ساڵ خزمەتی لە نەخۆشخانەکان دا هەیە شەهاد دەتنامەی دوکتۆرای phd لە دبلن لندن وەرگرتووە و شەهاد دەتنامەی (دبلوم)یش لە لیفرپۆل ئەوە بوو پێش سێ ڕۆژ ژوانم لێ وەرگرت چونکە وەکو دەزانین نۆشدار کاتی بۆ نەخۆشەکانە ، هەرچەندەش داوای لێ بوردنی لێ کردم چونکە نەیتوانی لە هەمان ڕۆژ چاوپێکەوتنەکەی لەگەل بکەم . . . . . چەند وێنەیەکم بۆ گرت پاشان پرسیارەکانم کە لە بارەی نەخۆشی ئیفلیج بوون ، لێ کرد .

● چۆن نەخۆشی ئیفلیج بوون لای منداڵ دەردەکەوێت هۆیەکانی ؟ نیشانەکانی و چۆنیەتی ڕەچاوکردن و چارەسەر کردنی بۆ ڕوون کردینەوە :

د . جەلیل بەرزنجی پێشەکی دڵشادی خۆی بەرامبەر بەگۆڤاری ڕەنگین و خوێنەرانی ڕەنگین دەربڕی پاشان بەزەردە خەنە ناسراوەکەیەوە وەڵامی پرسیارەکانی دایەوە .

هۆی ئەم نەخۆشی‌یە بەکێکەلە میکروبە ڤایرۆسەکان و دەکرێتە سێ بەش هەر بەشێکی دەبێتە هۆی تووش بوون بەم نەخۆشی‌یە کۆمەڵی یەکەم کۆمەڵی دووەم کۆمەڵی سێ‌یەم

هەرچەند کۆمەڵی یەکەم لە هەمووی زیاترو تەشەنەترە تووشی خانە دەماری یەکان (الخلایا العصبیە)دەبێت کەوا سەیتەرە دەکاتە سەر پەتی درکی‌یەوە (الحبل الشوکي) .

نیشانەکانی ئەم نەخۆشی‌یەشی بەم جۆرە ڕوون کردەوە یەکەمین جار بە سەرئێشەو قورگ ئێشەو تاو ڕشانەوە دەست پێ دەکات وهەندێ جاریش سکە ئێشەیشی تووش دەبێت مل و پشت و قاچەکانی وشك دەبن ئەم نیشانانە پێکەوە دەردەکەون یا هەندێکیانی دەردەکەون ، هەندێ جاریش تەنها نیشانەیەکی دەردەکەوێت ئەمە دەبێتە هۆی ڕەچاوکردنی نەخۆشی یەکە ئەگەر لێی پێس کرد ، دەبینین منداڵەکە خواردنی کەم دەبێ و مێزی دەگیرێت و گەرووی هەو دەکات ، هەروەها پەراسووەکانیش ئێشی پێ دەگەیەت . . زۆرجاریش گومان دەکرێت ئەو منداڵە تووشی هەڵامەت بوو بێت ئەم نیشانانە لەوانەیە هەمووی نەمێنێ بە بێ ئەوەی‌ئەو منداڵە تووشی ئیفلیج ببێت پاش ئەوە ئەم نیشانانە لە ماوەی سێ چوار ڕۆژ تەواودەبێت یاخود نیشانەکانی ئیفلیج بوون کاتێك پلەی گەرمایی دادەبەزێ ودەست دەکات بە دەرکەوتنی نیشانەکانی . . . ئەمەش لە ماوەی دوو ڕۆژ لە سەرەتای دەست پێ کردنی ، پەراسووەکە شل دەبێت و دەمارە تووشبووەکە جوڵانەوەی کەمتر دەبێت یا هەر لەوانەیە نەمێنێ پاش ماوەیەکی‌تر منداڵەکە لاواز دەبێت هەندێ‌جاریش ئەندامە تووشبووەکە گیردەبێت مەرجیش نی‌یە هەر تووش بوونێك بە — ڤایرۆسی ئیفلیج تووشی ئیفلیج ببێت ، بەڵکو ئیفلیجی منداڵان لە نێوان هەر( . . ١ تا . ٨٥ )منداڵ تەنها یەك منداڵ تووشی ئیفلیج دەبێت وکوتایی بە نیشانەکانی ئیفلیج دێت . . زۆجاریش هەروەکو وتمان وەکو هەڵامەت دەست نیشان دەکرێت .

● چۆنیەتی تووش بوونی

میکرۆبە کەلە ڕێگەی دەم دەچێتە لە شەوەو لەو شوێنە جێگیر دەبێت لەنێوان دەم و لوت هەروەها لە ڕیخۆلەکان و کۆئەندامی هەرس هێنان هەر لەوێ زاوزێ دەکات پاشان دەچێتە لوەی لیمف لەو شوێنانەی لێ‌یەوە نزیکن و دەچێتە خوێن لە خولی خوێناوی پاش ماوەیەکی دایەنگەیی کە لە نێوان ١ تا ٣ حەفتە دەخایەنێت . . کاتێك زرووفی گونجاو بۆ خۆی دەدۆزێتەوە دەچێتە کۆئەندامی دەماری خانەکانی لەڕێ ڕیشوڵی‌یە دەمارییەکان (الالیاف العصبیە) .

ئەم نەخۆشی‌یە متمانە دەکاتە سەر ژمارەی خانە دەماری‌یەکان کەوا

میکروبەکەی تیێدا نیشتەجێ دەبێت وتێکی دەدات لەوانەیە ژمارەیەکی کەم لە خانەکان تووش ببێت کۆمەڵێك لە پەراسووەکان کاری تێ دەکرێت ئەمەش قاچەکان دەگرێتەوەوزیاتر لە دەست پاشان پشت و پەراسووە تووشبووەکە لە پلەی گەرمایی کەم دەبێتەوە، هێزی دەگەڕێتەوە، ئەمەش پێویستی بە ۳ تا ٦ مانگ دەبێت هەتا ئەو هێزەی نگەڕێنێتەوە بە پێی هێزی ئیشەکە




دەگۆڕێت، دەبینین قاچەکانی لاواز دەبن بەڵام هێز دەگەڕێتەوە بۆ بەشێك لە قاچەکانی یاخود دەست و قاچەکان پێکەوە، لەوانەشە خانەکانی مێشك کەوا دەمارەکانی سەرو دەموچاوو کۆئەندامی هەناسە تیر دەکات و خوێنی دەداتێ بگرێتەوە ئەمەش کاتێ روو دەدات زۆر توند وتیژ دەبێ ڕێژەی مردووی تێدا زۆر دەبێ ئیتر ئەو منداڵە توانای قووت دانی نامێنێ هەروەها کۆکەش دەیگرێت و لەوانەشە بە دەرداوەکانی دەم و هەندێ

پاشماوەی خواردن بخنکێت... هەروەها لەوانەیە چاوی منداڵەکە خێل ببێت و هەناسەبڕکێی تووش ببێت و لە حاڵەتەقووسەکان دا خولی خوێناوی لە کاربکەون ومنداڵەکە بمرێت.

● چارەسەرکردنی●

هیچ دەرمانێك و چارەسەرییەك نییە بۆ نەخۆشی ئیفلیجی منداڵان نەك تەنها بۆ ڤایرۆسی ئیفلیجی منداڵان بەلکو بۆ هەموو چەشنەکانی ڤایروسی وەکو سورێژەو هەلامەت. هتد.

ڤایرۆسەکە خولی ژیانی تەواو دەکات ولە خۆیەوە دەمرێت. پاشان کارتێکردنی بەسەر مرۆڤ دەمێنێتەوە بە پێی هێزی کاریگەری و زاوزێ کردنی لەو شوێنانەی لە لەشی ئەو منداڵە جێگیر بووە پاش ئەوەی نەخۆشی ئیفلیجی منداڵان تەشخیص دەکرێت یەکسەر بە چارەسەری سروشتی دەکرێت، پاش ئەوەی ئیشەکە لەو شوێنانەی تووش بووە، نامێنێ. چارەسەری سروشتی چەند ساڵێك دەخایەنێت بەڵام بە بێ هودە تەنها ئەوە نەبێت ئیسقانە تووشبووەکە گیر نابێت و پەراسووەکانیشی لاوازنابن چونکە کۆئەندامی دەماری زۆر [حساسە]ئەگەر بفەوتێت هیچ شتێکی تر جێی ناگرێتەوەوەئەوەی ماوەتەوە بەر بەرەکانی دەکات و کاریشی ناتەواو دەبێت چارەسەری سروشتی ئەوە ناگەیەنێت منداڵە کەلەم نەخۆشییە رزگاری ببێت بەڵکو بۆ ئەوەی تیژی ئیشەکە کەم بکرێتەوە. چاکتر ریگاش بۆ ئەوەی بە سەر ئەم نەخۆشییە زاڵ بێت ئەوەیە تووش بوون بەم نەخۆشییە قەدەغە بکەین و لە منداڵەکە دووری بخەینەو لەڕێگەی کوتان (تلقیحات)...

ئەم کوتانەش زۆر ئاسانە چرکەیەك ناخایەنێ.. بە خستنی دڵۆپێك لە کەرەستەیەك (میکروبی خاملی)تێدایە کەوا. بەرگری لە لەشی مروڤ دروست دەکات.. دوژینەوی کوتانی ئەم نەخۆشییە نعمەتێکە بە سەر مرۆڤایەتی چونکە ئەم نەخۆشییە ئەگەر منداڵەکە نەکوژێ تووشی گیری دەکات و خیزانەکەی بە چاوی کزەوە سەیری منداڵەکەیان دەکەن، هەرچەندە دایکەکە دەیتوانی ئەم نەخۆشییەی لێ دوور بخستایەتەوە بە کوتانی سێ جاری هەر جاریك ۲ مانگی لە نێوان دایە....

لەبەر ئەوە ئامۆژگاری دایك دەکەین ئاگای لە منداڵەکەی بێت و هەرگیزاو هەرگیز کوتانەکەی لەبیر نەچێت جگەلە کوتانی خنکان و گزازو کۆکە کەوا بە شێوەی شرنقە دەبێت دوا کوتانیش کاتێك تەمەنی منداڵەکە دەگاتە ساڵ و نیویك، کوتانی دووەم... کوتانی بەهێز بوونە لە نێوان تەمەنی ٤-٦ ساڵ دەبێت، هەروەها کوتانی سورێژە پاش تەمەنی نۆ مانگە دەبێت ئەگەر لەم تەمەنەش لە بیرچوو، ئەوە ناگەیەنێت کەوا کاتی کوتانەکە تەواو بوو کوتانەکە دوو مانگی بۆ دانراوە چونکە چاکترین شێوازە بۆ دابین کردنی (مناعة)لە لەشی ئەو منداڵە ئەوەر دایکەکە پاش کوتانی یەکەم کە دوو مانگە دواکەوت و لە بیری چوو ئەگەر ساڵێکیشی خایاند زەرەری نییە بەڵکو هەر دەبێ بیدرێتێ.

جاری وا هەیە دایك دووکوتانی بۆ دەکات و سێیەمی لە بیر دەچێت... بۆ ئەم کەمتەرخەمی بە بکرێت بەرامبەر بە جگەرگۆشەکانمان...

با تەند روستی یان بپارێزین بۆ ئەوەی لە پاشە ڕۆژدا بە دڵ وبەگیان خزمەتی کۆمەڵگەیان بکەن.

**سمیرە محمد علی**

# راوێژکاری نوژداری

پاش ئەوەی داخوازی ساغلەمی و شادی و خوشی بو هەموولایەك دەکەین لەم ژمارەی گوڤارەکەماندا ولامی پرسیارانی چەند خوێنەری زێدە ئازیز و هێژا دەدەنیەوە . . .

کاك ئازاد کاروان برادوستی ل هەڤلێری . . . د پرسیت کو ئەڤە پینج سالە توشی پشی تەنگی یێ بی‌یە و گەلەك جیهێت کرین و چاك نەبی‌یە . . ل بەر توزی و گەرمی‌ی و قەلەبالغی و گیانی تێکدچیت . . ؟

برای هێژا ئازاد . . پشی تەنگی دوو جورن . . جوری ئێکی ئەوە کو توشی ژێت بچیك د بیت . . ئەو ژی ل بەر زیدەبینا هێزا هەستەوەریی بەرامبەر تشتێت دەرڤە . . واتە « حساسیە » جوری دووی ژی ل بەر هەوینا کەڤنا بوریت پشی‌نە « التهاب القصبات المزمن » . . کو ئەو بوری تەنك دبن و نەشین ب تەڤاڤی کار بکەن و هەناسە تەنگە دبیت . . لێ‌یا هەر وەکو تژە رونکری‌یەڤە ؛ پشی تەنگی‌یا تە ل بەر هوێی هەستەوەریی‌یە . . ئەڤ کارە واتە کاری هەستەوەریی میکانیزمەکی تایبەتی یێ هەی کو پشی تەنگی وەك بەرە ڤانی‌یەکی د هێتە بەر چاڤ . . چونکە ل دەمێ تشتی دەرامی و بیانی د هێتە د ناڤ گیانی مروڤی وەکو توزی و گولالێت گولا « حبوب اللقاح » و گەلەك تشتێت دیکە . . خوینا مروڤی و دەزگای بەرگرێی د لەشێ مروڤی‌دا هندەك چەکێت تایبەتی دژی تشتێ دەرامی دروست دکەن د بێژنی « دژەتەن » «Anhtibody» ئەو تشتێ دەرامی د بێژنی ئەنتیجین «Antigene» وکار تێکردنی ئەنتی بودی ئەنتیجین ڤێ هەستەوەریی پەیدا دکەت کو مژادەکێ تایبەتی ب ناڤێ هێستامین گەلەك دەرمانێت هەین کو ڤی کارەی رادگرن و دژی مژادی هێستامینی‌نە ڤێ هەستەوەریی رادگرن . . لێ‌یا هەر هەستەوەری‌یەکێ هویەکێ هەی ل بەر وێ هندێ چاکترین چارەسەرکرن بو ڤێ مەسەلێ ئەوە کو مروڤ خو ل وان تشتێت هەستەوەریی پەیدا دکەن دویر بکەت و هندەك فەحسێت تایبەتی بێ دا هەین ل ئاموژگا هەمستەوەریی‌دا « معهد الحساسیە » د هێنە ئەنجام دان دویر نی‌یە مفا و سودێ ژێ وەرگری . . بەلێ دەبیا بزانی کو ئەڤ نەخوشی یە نەخوشی‌یەکا گران نی‌یە . . لێ‌یا ئاسان ژی نی‌یە و دەمەکێ دوورو دریژێ دەستنیشان کرن و چارەسەرکرنێ پێ دڤێن و هیڤی دارین ل سەر وێ ریبازا نوژدار بو تە دادنێت ب رێڤە بچی . . ل وی دەمی هیچ گومان نی‌یە دێ هەر ل ڤێ نەخوشی‌ێ رزگار بی کاك دلزارلە سلیمانی .

کاکە گیان . . خەم مەخو . . بیری خو کوشتن مەکە . . ئەو شتی فەرموت لە هیچ فەحسەك دەرناچیت . .

هەفت سال بەسن کو هیچ پاشماوەیەك بە جێ نەهێلن با . ! شادی و خوشی دڵ و ژیانت پر بکەن . .

کاك خەلیل کەریم حەمەد لە چەمچەمال . .

کاکە گەلێك سوپاست دەکەین لە بەر ئەو هەستە ناسکەی بەرامبەر گوڤارەکەمانت دەربڕیبوو . . حالەتی تو ژی هویەکەی هەستەوەری‌یە واتە « حساسیە » و چاکترین ریگا پاك و پاکژی‌یە و قژ شوشتنیش روژی‌نەروژی لەگەل لەش شوشتن چاکترین ریگایە بو نەهێلانی ئەو خرووەی هەتە .

کاکە سوار رەسول کەریم لە کولیجی پەروەردەی بەغدا . . کاکە سوار لە گەل سوپاس و خوشەویستی‌یمان ئەلێم کە حالەتەکەت ئاسایی‌یە و هیچ ناسروشتی نائاسایی نی‌یە . . چونکە ئەو حالەتەی تو لێ دەترسی وینەو بابەت و هوی تایبەتی خوی هەیە . . لە بەر ئەوە کاکە گیان مەترسە و خویندنەکەت بە باشی تەواوکەو هەر بیریشی لێ‌مەکەوە . .

خوشکە دلسوز قادر سەعید لە سلیمانی گەلێ پێخوشحالین کە نامە رەنگینەکەت بە گوڤاری رەنگین گەیشت هەر وا چاك بزانە کە ریژەو نیسبەی گەرانەوەی فەتق « فوری » لە پاشی نەشتەرگەری کەم نی‌یە . . بە تایبەتی ئەگەر نەشتەرگەری‌یەکە لە دەرەوەی نەخوشخانە بکریت ، بەلام کە دووبارە لە نەخوشخانە نەشتەرگەری چاك ئەنجام دراو چاکبووە . . ئەوەشتێکی ئاسایی‌یە . . کە چی پەیدابوونی ئێش و ئازارو لە کارکەتنی قاچیك پاشی نەشتەرگەری نەخاسمە ئەگەر قاچە کار کەوتووەکە ئەو نەبێ کە نەشتەرگەری « فەتق »ی تێدا ئەنجام دراوە ئەوە هیچ پەیوەندی یەکیان نی‌یە . نەخێر . . بەلکو دەبێ تشتەکی‌تر بێت . . نەشتەرگەری لەلای راست ئەنجام دراوەو لای چەپ لە کار کەوتووە . . ئەوە چ پەیوەندی‌یەکیان هەیە . . ئەگەر مەسەلەی گرتنی بوری خوین نەبێت کە هەر گەلێك نادیرەو ئەو حالەتەی تو باس دەکەی ئەنجام نادەت لەبەر ئەوە دووبارە دەلێمەوە کە هیچ پەیوەندی‌یەك لە نێوان نەشتەرگەری یەکەی نەخوشخانەو ئێش و ئازارو لە کار کەتنی قاچی برایەکەت نی‌یەو دەبێ نوژداریکی تایبەتی دەمار ببینێ وهویەکەی دەستنیشان بکات تا چارەسەری ئەنجام بدریت .

کاکە مەحەمەد قادر رەسول لە کویە .

کاکە گیان لە ژمارەیەکی پێشوی رەنگین دا باسی تویشگی سەرو قژهەلوەرینمان کرد هیوادارم بگەریێوە سەرو بخوینەوە

خوشکە شەهێن مەحەمەدا .

دەرچوونی ریش لە دەم وچاوی ئافرەت هویە سەرەکی‌یەکەی لە یەك ترازانی ئاستی سروشتی هورموناتی سیکسی ناو خوینە . . نهو ئاستی سروشتی هورمونات یان لە یەك ترازانی بە ئامیر و دەزگای تایبەتی دەستنیشان دەکریت و پاشان لە روانگەی نەتیجەی ئەم ئامیرە پشکێنەرانە دەرمان دەردرینە ئافرەت بو ئەوەی هورموناتی سیکسی بگەرینەوە ئاستی سروشتی خوی . . ئەو جا ریشەکە لە خویەوە نامێنیت

خوشکە پەریشان لە قەزای کەلار .

بەکارهێنانی کەبسولی «ndocid» بەو شکلەی باست کرد هیچ زیانی نی‌یە ئەگەر مەعیدەت چاك بێت .



● د . نافع ئاکرەیی ●



# بیرەوەری یەکی خۆشی نەورۆز

بەهاری ڕەنگین سەرەتای بەدیارکەوتبوو، چیاسەرکەشەکانی کوردستان دەستیان بەفڕێدانی سەرپۆشە تەنکەکەی سەریان کردبوو. چرۆلە پشکوتنابوو، سەوزایی قەراغ شاری ڕازاندبوەوە، ئەرخەوانەکانی گردی سەیوان بەوڕەنگە جوانەیان فەرامۆشی‌یان بەشاردەبەخشێ. ئێمەیش دەستەیە هاوڕێ واپێك هاتبووین کە خێزانی پێکەوە لە سەیران و ئاهەنگی نەورۆزی ئەوساڵە دابەش داربین. سەعات یەکی پاش نیوەڕۆی ڕۆژی ١٨/٣/١٩٧٣ بووکە بروسکەیەکم لە دەزگای گشتی ڕادیووتە لە فزیونەوە پێ گەیشت بریتی بووەلەبانگە کردنم بۆیەش داربوون لەیەکەمین فیستیڤاڵی فلیم و بەرنامەکانی لە مەرفەلەستین کە لە ١٩تا ٢٣/٣/دەوام دەکات.

بەوپێیە دەبوایە دەست بەجێ بکەومەڕێ تاسبەنێی لەئاهەنگی کردنەوەی میهرەجانەکەدائامادەبم. بەدەم ڕێگاوەبیرم لە وئاهەنگە قەشەنگەی نەورۆز دەکردەوە کەواله کیسم دەچێ‌خەمی مناڵەکانیشم بووکەبەبێ‌من لەو نەورۆزەبێ‌بەش دەبن.

کەئوتومۆبیلەکە، ڕێگای دەپێچایەوە هەتاچاوبڕکات گوڵاڵە سوورەدە شت وهەردی ڕازاندبووەوە، ئەوخاکەپاکەجوانە تارای بووکێنی بەسەردادرابوو، دیمەنێکی هێندجوان بوو، هەزاران دڵی گوشراو بۆی دەکرایەوە. لەوکاتەدا شیعرەکەی ئەحمەدموختاربەگی جافم بیرکەوتەوەکەوتوویەتی:

بەبێ‌قەدری بەسەریارامەبوورن حورمەتی
بگرن
گوڵاڵەی سووری ئەم سەحرایە خوێناوی
جگەرتانە

کە لە دەربەندی بازیان بە ودیودا چووین، پۆل پۆل منالأنی کوردستان بەڕوویەکی خۆش ودەم بەپێکەنینەوە چەپکەنێرگسیان بە دوستەوەبوو بۆ ئەوەی ڕێبوارانی ڕێی بەغدانیشانەی بەهار لەتەك خۆیان دابە دیاری بۆ ئازیزانیان ببەن. ئەوشیعرەم هاتەوەیادکە شاعیرێکی عەرەب لەقەسیدەیەکی‌دا وێنەی ئەو مندالە نێرگس بە دەستانەی چەندبە جوانی کێشابوو. کەبەداخەوە ئێستا شیعروەکەم نایەتەوەیاد.

گەیشتینەبەغدا. ڕۆژی ١٩/٣ میهرەجان دەستی پێکرد، میوانێکی زۆر لەولاتەعەرەبی یەکان ولە ئەورووپاو ئەمەریکاوە بانگە کرابوون، لەهەر پارێزگایەکی عیراقیش دا یەکێك بانگە کرابوو. لەم بوارەدانەتوانم د ەربارەی فیستیڤاڵەکەو وفلیم وبەرنامەوباسەکانی بنووسم چونکە ئەوەیان دەرفەتی فراوانتری دەوێ . تەنیائەوەندە دەڵێم کە زۆرگرنگە وسوودبەخش بوو

* * *

سێیەم ڕۆژی میهرەجان، کات سەعات نۆی ڕۆژی ٢١/٣/١٩٧٣/یە شوێن ئوتێلی (صحاری). بەیانی‌کەلە ژوورەکەی خۆم هاتمە دەرەوە بەڕێوەبەری پێشوازیی ئوتێلەکەچەپکێك گوڵی زۆرجوانی دامێ لەتەك کارتێك دالەسەری نووسرابوو[جەژنی نەورۆزتان لێ پیرۆزبێ لەگەڵ سلاوی براتان(حمودی الحارثی] . چەپکەگولەکەم بردەوە ژوورەکەی خۆم ولە ناوسوراحیەك دادام نا ئەمجاهاتمەوە دەرەوە پێش ئەوەی بچمەڕیستورانتەکەو (حمودی) یان (عبوسی)بڵێین

بە پیرمەوەهات پێش ئەوەی سوپاسی ئەوهەستەناسکەی بکەم خێرامژدەیەکی‌تری‌دامێ ئەوی ڕاستی‌بێ‌بەهۆی ئەوەی کەماوەی دووساڵ دەبووبەرنامەی یەکێتی نووسەرانی کوردمان لەتەلەفزیونی بەغدا تۆماردەکرد، لە تەك ئەوهونەرمەندە ڕووخۆشەدا دۆستا ،تمان پەیداکردبوو، بەڵام ئەم هەستەی ئەمڕۆدە ری بری زیاترچووبەدڵما، پاشان وتم: مژدەکە چی‌یە؟ وتی: تۆناتەوێ لەڕۆژی نەورۆزدا لە ئاهەنگە وسەیران دابی؟

وتم: جا لەوەخۆشترهەیە! وتی: دەی سائەنجومەنی ئاشتی خوازانی عیراق ئیمرۆ دەعوەتیان کردووین ولە دوورگەی (أم الخنازیر) سەیرانیان بۆڕێك خستووین منیش وەل کاك حسین عارف دەڵێ: وتم: دیەکاویەکەن،پاش ماوەیەك میوانەکان گردبوونەوە، بەکۆمەل چووینە گوێ ڕوباری دیجلە، گشتمان سواری بەلەم بووین.بەگەشتێکی خۆشی دیجلەی ئەفسووناوی دابەرەو دوورگەی (ام الخنازیر)ڕۆیشتین لەوێ سەیران وئاهەنگ وشایی وگۆرانی ومۆسیقاوقەی خۆش دەستی‌پێ‌کرد. حمودیش کارێکی وای کردکە زوربەی میوانەکان تێگەیەنێ‌کەوائیمرۆجەژنی نەورۆزە وبەڕەسمیش هەموولونابخانەکان و کارگەکان وفەرمانگەکان لەپشوودان، ئێمەش ئەوکوردانەی لەومیهرەجانەدابەش داربووین ـ باسی نەوروزوگرنگی ئەم جەژنە لای کورد ـ مان بۆ دەکردن. ئەوانیش زۆربەخۆ شحاڵی‌یەوە جەژنەپیرۆزەیان لێ دەکردین. تاعە سرێکی درەنگە لەئاهەنگەدا بووین و شەوێش میوانی نەقابەی هونەرمەندان بووین، لەم ئاهەنگەی شەوێ‌دا هونەرمەندی،مەزن (حقی الشبلی) بەتایبەتی جەژنە پیرۆزەی لێ کردین. بەوشێوەیەئەوساڵەلە ڕۆژی نەورۆزدا ئاهەنگی میهرەجانی فەلە ستین وسەیرانی نەورۆز دەست لە ملاتێ یان کرد منیش هەرگیزیادی ئەوڕۆژەو دەست پێشکەری هونەرمەند(حمود الحارثی)م لە بیرناچێتەوە. هیوام وایە لە نەورۆزێکی تردایە کتری ببینینەوە.

● مستەفاسالح کەریم ●



# چاوی پشتەوەی جەماوەر

● روژنامە نووس ●

## ئەمجارەش لە ئــــێمەوە بۆجەماوەر

● بەو پەڕی شانازی یەوە ئەڵێین، تاکو ئێستا توانیومانە جەماوەرێکی زۆری کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان لە دەوری گۆشەی چاوی پشتەوەی جەماوەر کۆبکەینەوە، ئەویش بە خستنە پێش چاوی گیروگرفت و تەنگوچەڵەمەکانیان، لەلایەنی خزمەت گوزاریی دام ودەزگاو دایەرە رەسمیەکان و هەڵس وکەوتی نابەجێ و ناهەمواری ناوکۆمەڵ، ئەم مەسەلەیەمان لە نێوان ئەو هەموو ناماتانەوە زانی کە هەموو رۆژێ بە کۆمەڵ، ئەگەنە گۆڤارەکەمان. زۆر سوپاس بۆ هەموو ئەو دۆست و هاوڕێیانەی کەئەم گۆشەیەیان بەگۆشەی راستەقینەی زمانی حاڵی خۆیان زانیوەو لە دەرگایان داوین، خوا یاربێ ئێمەش هەموو هەوڵمان تەرخان ئەکەین بۆخزمەت کردن و بەدەنگەوە هاتنی ئەوان و هەموو کۆمەڵگای وڵاتمان بەگشتی و کوردستان بە تایبەتی و تەنها داوامان لە هەموو خوێنەرانی بەڕێز ئەوەیە، کە ناونیشانی تەواوی خۆیانمان لەگەڵ نامەکان دا بۆ بنووسن تاکو ئێمەش سەربەستانە بتوانین هەموو گیروگرفت و داواکانیان بخەینە ڕوو، ئەمجارەش دوو بارەی ئەکەینەوە، کە هەر نامەیەك ناونیشانی تەواوی دیاری کراوی پێوە نەبێ پشت گوێ ئەخرێ و وەڵام نادرێتەوە، هەر کەسیش ئەیەوێ ناوی بڵاونەکرێتەوە ئاگادارمان بکات، تاکو ئێمە لای خۆمانەوە، ناوی خواستراوی بۆ دابنێین و ناوی تەواویی لای خۆمان بپارێزین بۆ ڕۆژی خۆی و هەمدیسان ئێمە مەممنون.

تکاشمان وایە کە گیروگرفتی دووبارە بوەوەمان بۆ نەنێرن، وەك ئەوەی کە لەژمارەی پێشودا باسی گیروگرفتی شوێنێکمان کردبێ و خوێنەرێکی بەڕێز هەمدیسان باسی هەمان گیروگرفتمان بۆ بنووسێ، چونکە دووبارە بوونەوە کەڵکی نی یەو جێگاو نۆرەی خەڵکانی تریش داگیرئەکات!!.

## داوایەکی ڕەوا لەبەڕێزان پارێزگاری سلێمانی و هەولێرو دهۆك

● لە ژمارەکانی پێشوی ڕەنگین دا، بەتاکە تاکەو بە کۆمەڵ تەنگوچەڵەمەو گیروگرفت و داوای گەلێ لە مجمەعە تازەکانی هەموو ناوچەکانی کوردستانمان خستە بەرچاوی لێ پرسراوان، تاکو ئێستا وەڵامی کەسمان بەدەست نەگەیشتووە، !!. ڕۆژبەروژ نامەیەکی یەکجار زۆرمان لە هەموو ئەو مجمەعانەوە پێ ئەگات و هەموویان گیروگرفت و تەنگوچەڵەمەی چوون یەکیان هەیە کە ئەتوانین بڵێین هەموویان بریتین لە :ـ ئاوی خواردنەوە، زێراب، کارەبا قیرتاوی کۆڵان و شەقامەکان، تەلەفۆن، گرانی و نەبوونی هیچ جۆرە ڕێك و پێکی و یاسایەکی دیاری کراو لە بازارەکان دا بەرتیل و واسطەو واسطەکاری و خۆخۆیی، رۆنین و معامەلە دوواخستن نەبوونی و کەمی و گرانی نەوت و غازو بەنزین، نەبوونی شارەوانی و هەرچی مەسەلەیەکی خزمەت گوزاریی شارەوانی هەیە، لاوازیی دام ودەزگای بەڕێوەبردن و لێپرسراوان و مەسەلە ی تریش کەرەنگە بەشی زۆریان لە ژمارەکانی پێشودا باسمان کردبن.

● وا ئەمجارە لەبەر زۆریی نامەو سکالاکان، ئەم داوا ڕەوایەمان خستە پێش چاوی بەڕێزان پارێزگاری سلێمانی و هەولێرو دهۆك، کە بەڕێزیان خۆیان سەرێکی ئەو مجمع و کۆمەڵگایانە بدەن، تاکو بزانن لەوێ چ باسە؟ هاوڵاتیان چییان دەوێ، تاکو چارەسەری کوتوپڕی و زوو بەزوویان بۆبکەن و هاوولاتیان دڵ ئاسودەو سەرفرازو خۆش گوزەران بکەن و ئێمەش داوای سەرکەوتنی زیاتریان بۆ ئەکەین بۆ زیاتر خزمەت کردنی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان، بە سەرۆکایەتی سەرۆکی پاڵەوان سەرۆك صدام حسین (خوابیپارێزێ).

بۆ زیاتر رون کردنەوە، ئەوا ناوی ئەو دێ هاوچەرخانە ئەنووسین کە نامەی هاوڵاتی و خوێنەرانمان دەربارەی گیروگرفتەکانیان بەدەست گەیشتووە.

بازیان، کانی تو مەنصوریە پیرەمەگروون، چوارقوڕنە، سیبران، سەنگەسەر، دارەتو حاجی ئاوا، شیلادزێ

توەسوران، صمود، برایەتی نصر، تەکیەی کاکەمەند، بەحرکە، چمچمال، کەلار، دیانە، کەس نەزان، حەریر، باینجان، زەرایەن، باریکە، پێماڵەك،




## تەندروستی سلێمانی وەڵامان نەداتەوە.

● کاتی خۆی لەژمارە ١٠و ١٣و١٤ای ڕەنگین دا دووسێ مەسەلەمان خستبووە بەرچاوی کاربەدەستانی تەندروستی سلێمانی، ئەوانیش دڵسۆزانە وا هاتن بەدەنگی ڕەنگین و خاوەن مەسەلەکانەوە، وەك ئەوەی کە دائیرەی ناوبراو بەنووسراویان ژمارە (١١٧٤) لە ٩٨٩/٢/٦ دا ئاگاداریان کردین کە لیژنەیەکی لێکۆڵینەوەیان دروست کردووە بۆ ڕوونکردنەوەی مەسەلەکان و لە ئەنجامی پشکنین و لێکۆڵینەوەدا گەیشتوونەتە ئەوڕاستیانەی کە پێویستیان بە بینینی خوشکە بەڕێز محمد کریم کە لەژمارە(١٠)دا مەسەلەکەیمان لەژێر ناونیشانی دەستی برینداربووەو قاچیان شەل کردووە بلاوکردبووەوە و کاك عبدالله محمد اسماعیل شوفێر لە دایەرەی ئاوی سلێمانی کە مەسەلەی ئەمیشمان لە ژمارە ١٣و١٤ دا لە ژێر ناونیشانی(تەندروستی سلێمانی ئەی بۆ ئەمەیان ئەڵێن چی؟)بلاوکردبوەوە . وا ئێمەش تکا لەو بەڕێزانە ئەکەین کە بچنە دایەرەی ناوبراو تاکو مەسەلەکەیان بۆ چارە بکەن.

## پاصەکانی ئیسکانی سلێمانی ئیستۆپیان نی‌یە!

● ئەگەر ئوتومبیل ئیستۆپی نەبێ ، زۆر ترسناکەو لەوانەیە خەڵکێکی زۆر بکات بەژێرەوە ، بەڵام پاصەکانی سەر ڕێگای گەڕەکی ئیسکان لە سلێمانی، هەموو کاتێك بەهەوەسی سایەقەکانیان ئیستۆپیان نامێنێ و بەگوێرەی داواو هەوەسی نەفەری داماو کەپارەی خۆیشی داوەو لەڕێی خوادا سوار نەبووە ناوەستن و جاریش دێن بەگژ نەفەرەکان دا ، ناحەقیشیان ناگرم ، ڕۆنی ئیستۆپ دەست ناکەوێ . . !! بەهەر حاڵ لەم ڕووەوە کاك شەهاب بەرزنجی لە سلێمانی لە گەڕەکی ئیسکانەوە لە نامەیەك دا سکاڵا لەدەستی ئەم سایەقانە ئەکات و داوا ئەکات کە نەقابەی گواستنەوە لە سلێمانی چارەیان بۆ بدۆزێتەوە، کاك شەهاب خۆی ئەڵێ، یان پاصەکان بگۆڕن یان لە کۆڕی ڕۆشنبیری دانەسیحەت و سەرزەنشتی سایەقەکان بکەن . . . !

●وا ئێمە شچاوەڕوانی ولی دڵسۆزانەی نەقابەی گواستنەوەی سلێمانی ئەکەین و ئەگەر لەئەنجامیش ئاگادارمان بکەن ، ئەوا ئێمەو خەڵکی گەڕەکی ئیسکانیش گەلێ مەمنون ئەکەن .

## جەماوەری قەڵادزێ داوای مایکرۆویف و ئۆرزی یەکەیان ئەکەنەوە

●نامەیەکی پڕ سۆزو هەستی ناسکی کاك احمد فقی رەسول ـ ناوبانگە بە احمد شاری لە شاری قەڵادزێوە پێ گەیشت، کە وا لێرەدا دەقی نامەکەی ئەخەینە بەرچاوی کاربەدەستانی بەریدو تەلەفۆن و بازرگانی و چاوەڕوانی ئەنجامی باش و وەڵام دانەوە ئەکەین .

+ شارە جوان و خنجیلانەکەی قەڵادزێ وەك قەیرە کچێ بێنازە ، زۆر جار ویستوویانە هەڵیگرن و پیل بەستووی کەن . . یان گەورە بە گچکەی پێبکەن . . . ، یان بەزەبری خەنجەر بەشوی بدەن! ، بەڵام جوامێرانە ڕەدووش نەکەوتووە . . لە جوانی و قەشەنگی خۆی نەکەوتووە ، بەگژ گشت کارەسات و زەبرو زەنگێك دا چووە، بەرگری لە خۆی کردووە، قەڵاتە دێرینەکەی لە جاران سەرکەش و سەوزترە!دوو زێیە بچکۆلانەکەی لە هاژەو قەلبەزەو شەپۆلی خۆیان نەکەوتوون!! خەڵکی خودی شارەکەش ، لە خەسترین تۆپ باران و ڕۆژی ڕەش و دڵ تەزێندا ، لەکاتی جەنگی قادسیەی صدام دا پێیان نەنگی بووە، ڕەو بکەن و شار چۆڵ بکەن ، بەرگرییان کردووە، سەنگەریان لە ئامێزدا سازداوە، ئەم شارە جوانە جێگای بایەخی دەوڵەت بووە، هەر لەو تێڕوانینەوە، تەلەفۆنی مایکرۆویف و ئۆرزی باکیان بۆدانا، بەڵام بەهۆی هەشت ساڵەی جەنگە و نزیکی سەر سنورەوە هەردووکیان لابران . . !!

ئێستاش دوای سەرکەوتنمان لەو جەنگە ڕەوایەداو گەڕانەوەی ئاسایش بۆناوچەکەمان، هەموو جەماوەری شاری قەڵادزێ، داوا ئەکەن و هیواو ئاواتیان ئەوەیە کە لێ پرسراوانی دایەرەی بەریدو تەلەفۆن و بازرگانی ئاوڕێك لە گەڕانەوەی ئەم دوو پرۆژە گرنگە ئاوەدانی ئامێزە بۆ شاری قەڵادزێ بدەنەوەو هەوڵی دڵسۆزانە بدەن بۆ هاتنەدی ئاواتی ئەو جەماوەرەی کە توانی هەشت ساڵی ڕەبەق لەبەردەم لولەی تۆپی بێڕەحمی دوژمن دا سەربەرزانە ڕاوەستێ و هاوبەشی هۆکانی سەرکەوتنی گەلمان بکات .

## ● نامەیەکمان لەکاك فریدون عبدالرحمن باوکی رەنج لە سلێمانیەوە پێگەیشت، بەدرێژی باسی هەندێ ناتەواوی خەستەخانەی تەعلیمی سلێمانی بەشی منالْ بوون ئەکات .

لەبەر ئەوەی کە ئەو برادەرە ناونیشانی خۆی نەنووسیبوو، نامەکەمان بلاونەکردەوە، بەڵام بەڕێز دلطیف أمین بەڕێوەبەری گشتی دایەرەی تەندروستی سلێمانیمان ئاگادارکردو ئەویش داوای کرد کە ئەم برادەرە ئاگادار بکەین سەری لێبدات بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوشتانەی کە لە نامەکەیدا باسی کردبوو.

هیواداریین ئەو بەڕێزانە هەموویان سەر لە دایەرەی تەندروستی سلێمانی بدەن و ئاگاداریشمان بکەنەوە.



دەمـــەوعەسرانێکی درەنـگ، من و وێنەگری گۆڤارەکەمان، بڕیارمان دا ماڵـی [ کەریـــمـەفـەنـدی] بدۆزینــەوە. ئـەو کەریـــمـە فەنـدییەی کە هەموو دەزانن یەکەم پۆستەچی شاری هەولێر بووە... ئەوەی دەربارەی ناوونیشانی ماڵی خاڵـە کەریم دەمانزانی، تەنیا ئەوەبو کە خەڵـکـی گەڕەکـی تەعجیلە.. ئـەوگـەڕەکـە کۆنـە لەڕووی بیناسازیشــەوە هێندە جوانکاری تێدا بوو، کاکی وێنەگر زۆربـەیـانی تۆمارکرد.. لەم دوکان بۆ ئەو چایخـانـە.. لەم دەرگا بۆ ئەو دەرگـا... ئـەنجام پەنجەیان لەسەر ماڵی کەریمـە فەنـدی دانا.. لەگەڵ یەکـەم زەنـگی دەرگـا.. کـوڕە کەیهـاتـە دەر.. کـەووتیان: بەڵێ ئێـرە ماڵـیخـاڵـە کەریمـە... شـاگـەشکـە بووین بەوەی کە گەیشتین بەمەرام!

لە ژوورێکی خنجیـلانــە.. پیرە پیـاوێـك بەکـومـە ڵێکی زۆر لە نەوەکـانـی خۆی دەور درابـوو.. لەسـەر پێخـەفێکیپـاك و تەمیـز.. بەدیـار سۆپـەیـەکـەوە دانیشتبوو.. بەلـوتف و زمـانێکی شیـرینـەوە.. فەرمـــووی لێ کردین. هەردەشی گوت. لێـم مەگـرن.. توانـای هەڵـسانەوەم نییە.. دانیشن.. ماڵی خۆتانە...!

ووتم: خاڵۆگیان.. دەبێ بمبووری

## ● پوولی پۆستە بەیەک قروش بوو!

## ● پۆستەچی هەموو هەولێر بووم..!!

.. من شـەرمــەزارم کە بەهــەنـدی پرسیاروولام.. ئەزیەتت دەدەم و سەرت قاڵـە دەکـەم.. دەزانـم تۆ بەختیاریت و تاقەتت نەماوە!

*** خاڵـوگیان.. کەی.. وە لە کوێ لە دایك بوویت؟**

+ لە ١-٧-..١٩ لەگەڕەکی عارەبان لە هەولێر.. بـەو حیسـابە من ئێستا عومرم ٨٩ ساڵە..!

*** باشەخاڵۆ گیان.. خوێندووتە؟**

+ ئەی چۆن ڕۆڵــە.. لـەمـەکتـەبی ڕوشدیە بووم وشەهادەت نامەشم وەرگرتووە..

[ بانــگـی بەهـاری ژنی کرد.. هەرچـی کاغـەزو ماغـەزی هەیـە. لـەکـۆنـە دەلاقـەکـەی دەربێنێ.. بڕوانـامەکە لەسەرییەوە نووســرابـوو. دەوڵــەتـی عوسمانی..! چەند پلەیەکم خوێندەوە:

قورئانێ پیرۆز. ١، مەعلوماتي ديني ٩، حیسـاب ٩، هندسە ٧ ئەشیاء شعري ٧، تحریر ٦، بازی ٨، ئیتر ئەوانــیتـر. بـەزەحـمـەت دیاربوون. پولیکی کۆنیشی پێوەبوو..].

*** ئەو مەکتــەبی ڕوشـدیـە لە کوێ بوو؟**

+ لەلای مزگەوتی خانەقای ئێستا.

*** کێ لەو قوتابیانەت لەبیرە کە لە گەڵتابوون؟**

+مـوسـا ئاغـای کوڕی ڕەشیـدئـاغـا. (قـادرەفەندی)یش باوکی مەلاجـەمیل موختاری خانەقا بەڕێوەبەرمان بوو.

***کێ گەورەی شاربوو؟**

+ ئەحمەد ئاغای قەڵاتی..

*** کەی لە وەزیفە دامەزرای بەپۆستەچی؟**

+ بۆیـەکـەم جار لە ساڵـی ١٩١٧ بـەپـۆسـتـەچـی دامــەزرام. ئـەوکـاتـە تەنیـا من و یەکێکـی تر بووین [حـەسـەن قەلعـەلی]یـان پێدەگـوت.. من پۆستـەچیو ئەویش لە - بروسکـە - کاری دەکرد!

*** باشە. بەچەند دامەزرای؟**

+ هەوەڵ جار بە. ٤ڕوپیــە.. کە ئێستاوابزانم هەر ڕوپیەك دەگاتە ٧٥فلس

*** ئەی(پوول)ی پۆستە بەچەندبوو؟**

+ هەرپوولی بەیەك قرۆش بوو!

*** ئەی، وەکــو پۆستــەچی، ئەوکاتە بەچی هاتوچۆت دەکرد؟**

+هەوەڵ جار بە پێ پاشان وولاخیان هێنـا. پاشـان گەڕاینـەوە بۆ هاتـو چۆی بەپێ!

*** پۆستەت بۆکوێ دابەش دەکرد؟**

+ هەموو شاری هەولێر.. هەر خۆم بووم. پۆستەم دەبەست و شەویش



نۆبەتم دەگرت و نامەو بروسکەی بەپەلەمان دەگەیاندە ئۆردی..[سەربازخانە].

*** بێجگە لەووڵاخ..چی‌تر نەبوو؟**

+جاروبار..ئوتۆمۆبێلمان دەبینی!!

*** بەشێکی زۆری ئەو کاغەزانەی دەهاتن..بۆ کێ بوون؟**

+ بۆ پیاو ماقوولانی‌شار..وەکو رەشیدئاغا، علي پاشا، موسا ئاغا، مەلائەفەندی..بازرگانەکان..

**چ کاتێك مزگێنی‌یان نەدایتێ؟**

+ ئەوکاتەی کاغەزەکان خەبەری خۆشیان تێدا بووایە خەلاتیان دەکردم!

*** هەولێری ئەوکاتە چۆن بوو؟**

+ تەنیا چەند گەرەکێکی دیار هەبوون وەك سعدوناوە، تەعجیل، قەلا، عەرەب، تەکیە...

*** کەی خانە نشین کرای؟**

+ لە ساڵی ١٩٦٤ خانە نشین کرام، بەلام هەتا ئەو ساڵانەی ئاخیریش هەر سەرم لە پۆستەخانە دەدا، دلم پێ دەکرایەوە.

*** ئێستا تە ندرو ستیت چۆنە؟**

+ شوکر بۆخوا زۆر باشم.. ئەوەندە گەراوم و هاتوچۆم کردووە، دوورم لە نەخۆشی پیربوون..تەنیا قاچم رۆما نتیزمی هەیە..نەختێك چاویشم کزە!

*** خوا.. تەمەنت درێژتر کات!**

**● شێرزاد عبدالرحمن ●**

**وێنەگرتنی: عونی عبدالله**





# گرنگی قەلای شیروانە

وا شارە خنجیلانەکەی «دەشتی شێروانە» یش، وەکو هەموو «شارە رازاوەکانی کوردستان» کە هونەرمەند **دروست دەکەن؟**

شانازی **بە خۆیەوە** دەکات، بەکۆمەلە لاوێکی ئێسك سووك و خوێن گەرم و هونەرپەروەرەوە، لە بواری «هونەرو ئاوازی بەسۆزو رەسەنی خۆمالیمان».

## تیپی مۆسیقای شیروانە

لە دامێنی «قەزای کەلار» دا لە دایك بووە. شان بە شان لە گەڵ هەردوو تیپی «شانۆی سیروان» و تیپی «مۆسیقاو شانۆی کەلار» و هەموو تیپە هەست بزوێنەرەکانی کوردستانە رەنگینەکەمان کەوتە خزمەت کردن بۆ زیاتر بە سۆزکردنی «ئاوازو گۆرانی کوردی».

ئەم تیپە خنجیلانەیە:

لە رۆژی «١/١/١٩٨٧» وە، دامەزراوەو ئەندامانی بریتین لەم هونەرمەندە لێهاتووانە:

١ ـ بەرزان عثمان

٢ ـ علي عبدالقادر

٣ـ محمد عثمان

٤ ـ کامران عثمان

٥ ـ ئاری محمد

٦ ـ رشید محمد

٧ ـ عادل محمد

٨ ـ سامان مجید

٩ ـ جمال جهان بخش

١٠ ـ احمد بەرزنجی

١١ ـ عدنان زیرەك

١٢ ـ مکرم أکرم

«خوێنەری ئازیز رەنگین»

مامۆستا «بەرزان عثمان» سەرۆکی ئەم تیپە خنجیلانەیەو لە چەند گۆرانی‌یەك دا بەشداری کردووە بۆ «تەلەفزیۆنی» تەئمیم» وەکو «مۆسیقاژەنێك لەگەڵ «تیپی مۆسیقای خانەی مامۆستایانی سلێمانی» دا.

ئەم تیپە تا ئێستا خاوەنی «چەپکێ هۆنراوەو ئاوازی تازەی دەشتی گەرمیانە» کە لەم رۆژانەی دوایی‌یەدا خۆیان دەگەیەنن «بەتەلەفزیۆن» وەکو چەپکێ خونچەی نەکراوە لەساتێك دا بۆنیان هەموو ناوچە رازاوەکانی کوردستان دەگرێتەوە.

لە کۆتایی دا هیوای تەمەن درێژی بۆ ئەم تیپەو هەموو بەشێك لە تیپە خنجیلانەکانی کوردستان دەخوازین.

● لەگەڵ ئومێدی پێشکەوتنی گۆڤارەکەمان●

**● علي عبدالقادر حسین ●**



# بۆم گوڵبژێر کردووی

عەلی ئەمین ڕۆژنامە نووسێکی میسری‌یە. ساڵەهایەکی دوورو درێژە لە ڕۆژنامەکانی میسردا کاردەکا. بەر لە میللی‌کردنی ڕۆژنامە نووسی لە میسر خۆی‌و مستەفای برای دەزگایەکی تایبەتی گەورەی ڕۆژنامەنووسی‌یان هەبوو. چەند ساڵێك لە سەردەمی سەرەکی کۆچ کردووی میسر جەمال عەبدوناسردا دەوری نەبوو، چونکە بە ڕۆژنامەنوسێکی سەر بە ڕۆژاواو بیروباوەڕی لیبرالی ڕۆژاوا ناسراوەو، **لەو ڕێگایەوە** خۆی‌و براکەی بەوە بەدناو کرابوون کەبۆ ئەوان کاردەکەن، تا **لە** سەردەمی ئەنوەر ساداتا جووتەبرا ڕێ‌و شوێنی خۆیان، ئازادەیەك، وەرگرتەوەو هاتنەوە ناو ناوان ئەو بەدناو کردنەی دوو **برا**، بەڕاست بوو بێ یا بەدرۆ، نکوولی لەوە ناکرێ کە عەلی ئەمین ڕۆژنامە نووسێکی خاوەن بەهرەو تاقیکردنەوەیەو، ئەوەی لە **مەیدانی** بیرو کاری ڕۆژنامە نووسیدا دەیڵێ بەرلەوەی بیروباوەڕی تایبەتی خۆی بێ، پوختەی ئەو تاقی کردنەوەیە تێکرای ئەو ڕۆژنامە نووسانە دەیزانن کە بۆ گەیاندنی پەیامێ هاتوونەتە مەیدانی ڕۆژنامەنوسی‌یەوەو ئەم ڕێگا پڕ درك و ودالەیان بۆخۆیان هەڵبژاردووە. بەڵکو هەموو ڕۆژنامە نووسانی تریش دەیزانن، بەڵام کەلێی بێ دەنگن، لەبەرئەوەیە مەسلەحەتێکی تەسك لۆکەی ئاخنیوەتە گوێیان.

یەکێ لەو تەجرەبانەی عەلی ئەمین کە لەم دوایی‌یەدا لە ڕۆژنامەی (الاخبار)ی میسری‌دا بڵاوی کردووەتەوە ئەمەی پنەوەیە کەوا ئێمە گوڵبژێرێکی لێ پێشکەشی خوێندەوارانی (ڕەنگین) دەکەین.

عەلی ئەمین دەڵێ:

لەم چەندانەدا کۆمەڵێ لە قوتابی‌یانی کۆلێژی ڕاگەیاندن هاتنەلام، هەندێ پرسیاریان لێ کردم و منیش وەڵامم دانەوە. لێیان پرسیم: دوارۆژی ڕۆژنامە نووسیت لە ولاتانی عەرەب دا چۆن دێتە پێش چاو؟ منیش وتم

بەستراوە بە دوارۆژی ئازادی یەوە. **ئەگەر** ئازادی بەربڵاوو بەدەرەتان بێ **ڕۆژنامەنوسی گەورەیان تێدا هەڵ دەکەوێ. ئەگەر تەسك و تر ووسکیش بێ ڕۆژنامەنوسی نابووت و ناچیزو بچووکیان تێادا پەیدا دەبێ**. ڕۆژنامە نووسی وەك باخچە وایە، لە سایەی ئازادی‌دا دەبوژێتەوەو گەشە دەکاو لە سایەی مل هوڕی‌و تەنها بە قسەی خۆ قایل بوونیشا سیس دەبی‌و دەپووکێتەوە.

لێیان پرسیم: ڕاستە دەڵێن قانوونێ دەردەچێ دەڵێ مەرجە ڕۆژنامەنووس کۆلێژی ڕاگەیاندنی تەواو کردبێ؟ منیش وەڵامم دانەوە: لە هەموو جیهانی شارستانە تی‌دا قانوونی‌وا نی‌یە. هەر لەم ولاتی میسرەی خۆمان دا من و جەلال حەمامیسی لە کۆلێژی ئەندازیاری دەرچووین. سەعید سونبولی سەرەکی بنووسانی ئەلئەخبار لە کۆلێژی زانست دەرچووە. عەلی جەممالی سەرەکی پیشووی ئەنجومەنی بەڕێوەبەرێتی ئەلئەهرام لە کۆلێژی کشتوکاڵ دەرچووە. ئەنیس مەنسوور لە بەشی فەلسەفەی کۆلێژی ئەدەبیات دەرچووە.. یووسف ئیدریس لە کۆلێژی پزیشکی دەرچووە. تاقە سەرەك بنووسانێ بەکالۆریسی ڕۆژنامەنوسی بەدەستەوە بێ مستەفا شەردیی سەرەکی بنووسانی ڕۆژنامەی (ئەلوەفد)ە.

لێیان پرسیم: مەرجی ڕۆژنامەنوسی سەرکەوتوو چی‌یە؟

وتم: ئەوەیە دڵداری ڕۆژنامەنوسی بێ. شەوورۆژی بیست و چوار سەعات ڕۆژنامە **نووس بێ. نە حەسانەوەی هەفتەو نە پشووی ساڵانەی نەبێ. زۆر بخوێنێتەوە.**

**خوێندنەوە بۆ بنووس وەك بەنزین وایە بۆ ئۆتومۆبێل. ئۆتومۆبیل** بەنزینی تیابێ ڕێ‌دەکا. بەنزینی لێ بیرێ پەکی دەکەوێ. دەبێ ڕۆژنامەنووس وا هەست بکات مل کەچی ڕۆژنامە نووسی‌یە نەك هی دەسەلات بەدەستان. وا هەست بکا خزمەتکاری بێ دەسەلاتانەودەسەلاتداری سەر بەهێزان.. لە ڕۆژنامەنوسی بەولاوە پیشەیەکی تری نەبێ. ڕۆژنامە نووسی ئافرەتێکی‌وایە هەرگیز بەوە قایل نابێ هەوی‌و هاوبەشی بێتە پاڵ. دەبێ ڕاستگۆبێ، هەواڵی درۆ نەنووسێ. ئەو ڕۆژنامە نووسەی درۆ بڵاودەکاتەوە، وەك ئەوەیە پارەی ساختە دەخاتە بازارەوە.

لێیان پرسیم: ڕۆژنامەنوسی بەهێز چی دەکا؟ منیش وەڵامم دانەوە: هیچی بۆخۆی ناوی‌و مرخی لە هیچ خۆش نەکردووە. لەخوا بەولاوە لە کەس ناترسێ. ڕۆژنامە نووسی بەهێز کاتێ پەلاماری سوار دەدا کە بەسەر **ئەسپەکەیەوە بێ. کە گلا ئیتر دەسبەرداری دەبێ‌و نوخنی** ناکەوێ. باوەڕی بە ئازادیی بیروباوەڕ هەیەو قەدری بیروباوەڕی بەرانبەرەکەیشی دەگرێ. لەسەر ستەمکاران **و** گوێ بۆ خەڵك شل نەکردووان ناکاتەوە، بەڵکو لەپاڵ چەوساوەو پێشێل کراوان دا دەوەستێ. دەنگی ئەوانەیە دەنگیان **دەرنایەت**. تەنیا زمانی گەل نا، بەڵکو دڵ و دەروونی گەلیشە.

خوێندە **واری ئازیز!**

ئەمە ڕای ڕۆژنامە نووسێکی میسری‌یەکە لام وایە پاش ئەوەی خۆی پێی بە سکڵی خودسەری‌و گوێ بۆ کەس شل نەکردنی دەسەلاتدارانا چزا، هاتە سەر ئەم بیروڕایە.. هەرچی ئێمەیشین ئاواتە خوازی ئەوەین هەموو ڕۆژنامە نوسە کانمان ڕۆژێ لەڕۆژان بیرێکی‌وا لە مێشکیان دا بێ بە خولیا.. ئەگینا نە ڕۆژنامەنوس هەرگیز لە مووچەخۆرێکی کەس نەناسی میری زیاتری لێ دەردەچێ‌و، نە ڕۆژنامەیش بەکەڵکی لەوە زیاتر دێ عەتار لە دووکانەکەیا بابەتی عەتاری پێوە بپێچێ‌و بیداتە دەستی کڕیارەکانی.

● محمدی مەلا کریم ●

# نەورۆزی بەستۆرە بەر لە ٣٠ ساڵ

ناز حیدری ●



منـدال بووم بەئـاسـتـەم وەبیـرم دێ، ئیـوارەیـەکیـان رۆژەکـەی نە سارد بوو نە گەرم، دووان لە برا گەورەکـانـم هاتـنـەوە ماڵـێ جەرحـەیـەکـی [جـەوانـە]جـووتیـارانـیـان بە دەستـەوە بوو چەنـد ماسیکی بچکـۆلانـە یتێـدا بوو. . ئەوکاتـە هەر ئەوەندە تێ گەیشتم، ئەو دوو برایەم لەگەڵ ژمارەیەك لە لاوانی هەولێـر بەنیـازی سەیـران چوونـەتـە دەرەوەی شار، **کە** لە کەژی بەهاران خەڵکی تەنیا بۆ دەوروپشتی شار نەك دوورتـر دەچـوونـە سەیـران . . . . بەلام ئەو کۆمـەڵـە لاو و قوتابیانە روویان لە گوندیتوورەق کرد **بوو**. . کە دەکـەوێتـە نێوان هێلی باکوور و رۆژا ئاوای هەولێر. . پاش ئەم سەیرانە، بەچەند ساڵێك لە شاری هەولێـر بەرامبـەر سینـەمـای صلاح الـدینی ئێستـاکـە کۆبـونەوەیێکی فراوان کرا، خەڵکێکی زۆر بەگوێرەی واژەی دانیشتـوانی ئەوسـای هەولێـر لە کۆبـونەوەکەدا ئامـادەبـوون، منیش هەرچـەنـد منـداڵ بووم ،بەلام بەهـۆی براکـانـم وئـەو گەنجـانەی هاتووچووی ماڵی ئیمـەیـان دەکـرد، کە هەمـوویـان سەرپـەرشتی ئاهەنگەکەیان دەکرد چوومە تەماشاکردنی کۆبونەوەکە ، رۆژەکـەی زۆر خۆش بوو، لەوێ بۆ یەکـەم جار وشەی «نەورۆز»م بیست و کەجەژنێکی کوردانە، ئەو کۆمـەڵـە لاو و قوتـابیـانـە یادی دەکـەنـەوە و ئاهـەنگ دەگێـرن. . ئـەم ئاهـەنگـە ساڵی ١٩٤٦ بوو، پاشـان تێ گـەیشتم سەیـرانـەکـەی گونـدی توورەقیش یادی جەژنـی نەورۆز بووە وبەلام بە نهێـنی کراوە!! ساڵی ٩٤٧تـیـش دیـسـان لە شاری هەولـێـر یادی جەژنی نەورۆز کرایـەوە، بەرێـکـەوت رۆژەکـەی زۆر ناخـۆش وباران بوو. . وەبیـرم دێ کە لەمـاڵـەوە باسی ئەوە کرا ئەگـەر هاتـو ناوی [ ٤٠]چـل سەر کەچەڵ لە کاغـەزێـك دا بنـووسرێو پاشدان بسووتێندرێ ئەوا بارانـەکـە دەوەستێ،ئاهـەنگی نەورۆز ساز دەکـرێ! بەڵێ، زۆر چاك لە بیـرمـە کە دەست کرا پەیتـا پەیتـا ناوی چڵ کەچـەڵ دەست نیشان بکرێو بنووسرێ!! بە ماوە ی سەعـاتێـك کارەکە ئەنجام درا و بەرێکەوت باران وەسـتـاو!! بۆ پاش نیـوەرۆکـەی ئاهـەنگی نەورۆزی ئەو سالـیش ساز درا. . پاش ئەم نەورۆزە

وولات بەگشتی تووشی بارێکی ناهـەموار وراونان و بەنـدیخـانـەهـات ،سیاسەتی زیاتر دوژمن بە میللەت بەتـایـەتی پاش ماوەیـەکی کورت لە راپـەرینەکـەی کانوونی دووەمی ١٩٤٨ پەیرەو کرا. . !؟**جا مەسەلەی** یادکـردنە وەی جەژنی نەورۆز بە ئاشکراو نهێنی زیندە بەچـاڵ کرا. . !! بەلام لە کۆتـایی ساڵانی پەنجاکان، بەتـایبـەتی پاش شەری قەنـاتی سوێس جوولانـەوەی نیشتیمـانیو نەتـەوەیی بوژایـەوە، ئاگـری خەبـاتی کۆمەڵانی خەڵك خۆش تر دەبو، ئەوە بوو ژمارەیێك لە قوتـابیـانی **هەولێـر بە** سەرکـردایـەتی یەکێتیی قوتـابیـانی کـوردستـان یادی جەژنی نەتـەوەیی کورد نەورۆزی ١٩٥٨ بە شێوەیەکی نهێنیان کرد، ئەویش **لە بەستۆرە بوو، کە لە[ ٨٠]**قـوتابی زیاتر ئامادەبوون **بۆ** سازدانی ئەم یادکردنەوەیە، یەکێتیی قوتابیان بەر لە داهـاتنی رۆژی ٩٥٨/٣/٢١ نەخشـەی چۆنیـەتی چوونـە دەرەوەی قوتـابیـان و کەرەستەی ئاهەنگ کێشـ بووی، ئەوە بو، بەیانییەکەی رۆژی ٩٥٨/٣/٢١ لە سەعـات ٧ـ تـا ٨ پەیتـا پەیتا قوتابیان سێ سێ، چوار چوار پێکـەوە بە پێیـان بەنێـو دەغـل و داتی سەوز یقـەراخ شار بە چەنـد کیلۆمەترێك مەڵبەندی شاریان بەجێ هێشت، لە وێـوەش ئۆتـۆمـوبێلیکی پاسی دارەکـان چاوەرێیـانیـانی دەکـرد. . پێشـەکی چووینە گوندی بەحرکە لە ماڵی خاوەن گوندەکە چەند رایەخ و بەرەیـان هێنـا، ئەوسا بۆ سەعات دەی بەیانی گەیشتینە مەڵبەندی دیاریکراو لە ناوچەی بەستۆرە. . .

راستییـەکـەی ئەم نووسینـە لێـرەدا ئەوە هەڵ ناگـرێ باسی بەرنـامـەو ناوەرۆکی ئاهـەنگـەکەو ئەو کەسانەی لەوێ ئامـادە بوون بکـەم . . . ئـەمەیان بۆ دەرفەتێکی دیکـە بهێنێ. بەلام ئەوەی شایانی باسە سر وودو وتار و چالاکـی یەکـانی ئاهـەنـگ تێـر و تە سەل بوون، نیشـانـەی رەنگـدانـەوەی گیـان و هەستی خەبـاتی نیشتمانپەروەری و نەتەوەیی قوتابیەکان بوو. . !

ئەم چەنـد دێرە زانیارییەکانی بەگوێرەی گەورەیی ئەو هەوڵ و کۆششـانـەی بۆ یاد کردنەوەی جەژنی نەورۆز کراوە لەسـەرەتـای چلەکـانـەوە تا دوا نەورۆزی پێش شۆرشی ١٤ی تەمووز زۆر کەمن ، بەلام راستییەکی مێـژوویی ونـەتـەوەیی دووپـات دەکاتەوە کە قوتابیانی هەولێـر بەپێی توانـا وتێگـەیشتن وگیـان و هەستی نیـشـتمـانپـەروەی و نەتـەوەیی لەلایـەك، دەوری لێهـاتـوویی جوولانـەوەی ئازادی خوازی لەئـاستی ولات بەگشتیو کوردستان بەتایبەتی لەلایەکی دیکەوە درێغیان نەکردوە.

پاش ١١ی ئـاداریش «بـەستـۆرە» هـەمیـسان بووە مەڵبەندی **ئاهەنگ گێرانی بیرەوەری جەژنی** نەورۆز. . . .

هەرچـەنـد «بەستورە» بەر لەوەی ناوی لە رەوتی جوولانـەوەی نەتەوایەتی تۆمار بکرێ، بەوەی کەپێش ١٤ی تەموز بۆ یەکەم جار بە نهێنی بیرەو ەری جەژنی نەورۆز ـی بەخـۆوە دیـوە، ناوی بەسـتـۆرە **لە** فۆلکلۆری کوردیدا تۆمار کراوە، کە لە حەیرانێك دا هاتووە:-

«لە گردە چاری، کزەیێ نەرمە شەماری
دەدا لە گوێی گواری، لە پەرێی خەزیمی ، لە پەرچـەمی مرواری
ئەمـن بە خورامی مەولـود حەسـەن ئاغـای کەردێ نکا
وەدی لەشکـری دەشکێنی لە دەو بەستۆرەی گۆرانان بە تاقەسواری



# تایلەند

## یان خاکی سەربەستان

**گۆڤاری (نەشناڵ جیوگرافی)کۆمەڵی جیوگرافی ئەمریکا توێژینەوەیەکی کۆمەڵایەتی و ئابوری و مێژویی و رامیاری دەربارەی (تایلەند)لە (٤٨) لاپەڕەی پر وێنەی هەمە چەشنەدا بڵاو کردبۆ و، بەو مەبەستەی هەندێ زانیاری گونجاوی بە سوودی لێ بخەمە بەر دەستی خوێنەرانی ئازیزی (رەنگین )ەوە، ئەم وتارو وێنانەم لێ پێك هێنان .**

**●انور محمد قرەداغی ●**

وڵاتی (تایلەند) کە تا ساڵی ١٩٣٩ پێی دەوترا (سیام) کەوتۆتە باشووری خۆرهەڵاتی کیشوەری ئاسیاوە. وڵاتانی لاوس و کەمپوچیاو مەلەیزیاو بۆرما لە سنورەکانیان دایە. (تایلەند)کەبە واتە خاکی سەربەستان دەگەیەنێت، لە رووی ئابوری‌یەوە، لە ریزی ئەو وڵاتانەی خواردەمەنی بۆ دەرەوە دەنێرن شەشەمینە لە جیهاندا. تەنها برنج ساڵی لە بلیۆن و نیوێك دۆلار پترتر پارەی بێگانەیان دەست دەخات و، سوودی هاتنی گەشتکەرانیش لە بلیۆنێك دۆلار زیاترە. بۆیە نزیکەی پانزە هەزار ژوری ئوتێلی پلەیەکی رازاوەی تێدا دروستکراون. پارەی تایلەندی (باهت)ی پێ دەوترێت و بۆ گۆرینەوە بە پارەکانی وڵاتە پێشکەوتوەکان دەگونجێت . رێژەی پەرەسەندنی ئابوری ساڵانەیان لە دەورو بەری ٦ـ٨لە سەدایە .

بێ گومان هەموو بارێکی ژیانیان ئاوا گەش و روناك نی‌یە. باری رەش و تاریکیشیان زۆر تێدایە . لە (٤٨) ملیۆن نزیکەی پانزە ملۆنیان دەستکەوتی ساڵانەیان لە (٢٠٠ .)دۆلار پترتر نی‌یە. کۆمەڵی کێشەی سنورو، کریارو فروشیاری (ئوپیەم)و (هێروین)و پە نابەرو ،لە میری یاخی بووشیان هەیە . روبەری تایلەند(٥١٤) هەزار کیلۆمەتری چوار گۆشەیی‌یە پێش هەزار ساڵێك دانیشتوەکانی لە وڵاتی چینەوە بەرەو خوار هاتن و تا ساڵی (١٧٧ .)بە دەستی داگیرکەرە











بورمی‌یه کانه‌وه چه‌شتیان . به‌لام له‌و ساڵه‌دا، به سه‌رۆکایه‌تی به‌ره‌ی نه‌وه‌ی (چه‌کری) ده‌ستیان به‌سه‌ر کاروباری وڵاته‌که‌ی خۆیاندا گرت وهه‌ر ئه‌و پیاوه‌ش بوو به مه‌لیك (رامه‌ی)یه‌که‌م یان. له ساڵی(١٨٨٢) دا هه‌مان مه‌لیك پایه‌ختی له (سوخۆسای)یه‌وه بۆ (بانكۆك)گوێزایه‌وه.

بانكۆك شارێكی زۆر خۆش و دڵگیره. بۆ بازرگان و گه‌شتكه‌ر هه‌موو پێداویستی‌یه‌كی تێدا ڕه‌خساوه. دانیشتوانی پێنج ملیۆنن. بانكۆك پڕه له كۆشك و بینای به‌رز به‌رز . هه‌ندێكیان





ئەوەندە بەرزن بەشی سەرەوەیان لە هەورەکاندا شاردراونەتەوە. ئاینی گشتی تایلەند (بوزی)یەو ئیسلامیشیان تێدا هەیە. زوربەی دانیشتوان (تایین)و نەتەوەکەمایەتی وەکو (خمێر)و (کارین)و( مەلەیی)و (ڤیتنامی)و (چینی) یشیان تێدایە.

بارانێکی یەجگار زۆر لە بانکۆك دەبارێت و زۆربەی دانیشتوان تا ئێستا ئاوی خواردنەوەی گشتییان نییە . لە بەر ئەوە بە هەزارەها بیر لە گشت بەشێکی شارەکە هەڵکەندراون و بۆ هەر لایەکەوە بڕوانیت کەشتی و پاپۆڕەو خەریکی بارکردن و گوێزانەوەی گونیە برنجن.

لە ساڵی (١٩٢٦)دا حەوت ئەفسەری تایلەندی لە پاریس کۆ بوونەوەو پلانێکیان بۆ گۆڕینی رژێمی وڵاتەکەیان دانا بۆ ئەوەی لە شاهەنشاهیەکی هەموو شت بە دەستەوە بیگۆڕن بۆ مەلیکی دەستوری. لە ساڵی(١٩٣٢)دا هەوڵەکەیان سەری گرت. شۆڕشگێرەکان بە(دەبابە)و چەکەکانی دیکەوە بەرەو کۆشکی مەلیك چوون . مەلیك رامای حەوتەم لە سەر پلیکانەی کۆشکەکەی وەستا بوو، خۆشهاتنی لێکردن بەلام ووتی: (لەژێر کاریگەری دەبابەو تفەنگدا مەلیك ناتوانێ گفتوگۆتان لەگەڵدابکات). ئیترئەوانیش دەبابەکانیان ناردە دواوەو ئەنجا دەستورە تازەکەیان دایە دەستی مەلیك . ئەویش چاویلکەکانی پاك کردەوەو دەستی بە خوێندنەوەی کرد. بەو شێوەیە، دەستەڵاتی هەمە چەشنەی مەلیکی دوایی هات و لاپەڕەیەکی تازە لە مێژوی تایلەندا دەستی پێ کرد.

مەلیکی ئێستایان مەلیك رامای نۆهەمە. لە ساڵی (١٩٢٧) لە ئەمریکا لە دایك بوە لە کاتێکا باوکی لەوێ ئەیخوێند. مەلیك رامای نۆهەم خوێندنی لە سویسرە تەواو کردوە و بەگەنجی زۆر حەزی لە موسیقای جازو ئوتومبیلی خێرا بووە بۆیە بە ئەنجامی رووداوێکی ئوتومبیل چاوێکی کوێر دەبێت و لەو کاتەدا لەخەستەخانەیەکی سویسرە دەبێت ئەکەوێتە داوی دڵداری (سیرکیت)ی کچی یەکێ لە دبلۆماسی یەکانی وڵاتەکەی خۆیان و ئیتر مارەی دەکات. بە مردنی ناوەختی باوکی و براگەورەکەی ئەم لە تەمەنی هەژدە ساڵیو راستەوخۆ پاش جەنگی جیهانی دوهەم لە ساڵی (١٩٤٦)دا بە کۆشکی مەلیکی دەگات. دانیشتوان ئەو یان خۆش





دەویـــت و ئەمـــیش و مەلـــیــکـــە (ســـیـــرکـــیـــت)ی ژنـیـشـی زور خەمـــخـــوارو دڵـــــــۆزی گەل و ولاّتـەکـەیانن . هەر لە بەر ئەوەشە تا ئێستـا چەنـد کودیتـایەك بۆ گۆڕینی رژێمی ولاّتـەکـە روویان داوە بەلاّم دەستـکـــاری رێـــازی مەلیکی‌یـــە دەستوری یەکەیان نەکردووە . یەکێ لەو کارانـــەی خستـــویـانـەتـە سەر شانیـان هەوڵـدانـە لەگەڵ ڕەنجبەرە شاخاوی‌یەکانیاندا کەواز لە چاندنی (ئـۆپـیـۆم)و (هیـروین)بهێنن‌و بۆئەو مەبـەستـەو بە یارمـەتی چەند ولاّتان وڕێکخراوەکانی جیهان یارمەتی یان دەدەن و تۆویـان دەدەنێ بۆ چانـدنی



بەرهەمانی دیکەی وەکو قاوەو پەتاتە . . .

تایلەندیەکان زوو زوو بیری گەشتکەرانی وولاتەکەیان دەخەنەوە کە ئەگەر دەیانەوێت باش لە تایلەندو دانیشتوانی بگەن ئەوا دەبێت بچن بۆ (سوخوسای)پایتەختی کۆن و ئەو نووسینەی پێش حەوت سەد ساڵ لە دیوارێکی بەردینەیدا هەڵکەندراوە بیخوێندنەوە کە دەڵێت:

(سوخوی لە برەودایە، ماسی لە ئاوەکەی‌دا هەیەو لە دەغڵەکانیا برنج هەیە. مەلیك باج لە دانیشتوان ناسێنێت. ئەوەی دەیەوێ بازرگانی زێرو زیوو بکات دەیکات . . . ئەوەی دەیەوێت پێ‌بکەنێت پێ‌دەکەنێت. ئەوەی دەیەوێ گۆرانی بڵێت گۆرانی دەڵێت) . .

---

پەراوێزەکان

ئەم بەرهەمەو وێنەکانی لەم گۆڤارەوە وەرگیراون:

NATIONAL GEOGRAPHIC VOL.162 NO.4

OCTOBER 1982

OFFICIAL JOUR NAL OF THE NATIONAL GEOGRAPHIC SOCIETY

WASHINGTON D.C.- U. S. A. ( Pages 486 - 534)



یەکەم ئافرەتی کورد
لەکۆلیژی هونەری وەرگیرا



# خاتوو بدیعە دارتاش

تا ئیستاش کە باسی گیروگرفتی شانۆی کوردی دەکرێ نەبوونی ئافرەت دەبێتە سەرباسی زۆریەی لێکۆلینەوەکان، لەم سالانەی دواییدا کۆمەلێك لە کچانی کورد، ئامۆژگاو پەیمانگای هونەرییان تەواو کردو رۆشنایی‌یە کیان خستە سەرشانۆکان.

ئەو کاتەی خاتوو(بەدیعە)چووە کۆلیژی هونەرە جوانەکانی بەغداد لای زۆربەی خەلکی ئەم کارە بەتاوان ئەدرایە قەلەم، سالی ١٩٦٨ یەکەم سالی خوێندنی خاتوو بەدیعە بوو،

توانی بە پلەیەکی باش خوێندنەکەی تەواو بکات و بگەرێتەوە بۆ خزمەت کردنی هونەری کوردیمان.

لێرەدا دەمانەوێ پرسیارەکانمان بەگشتی بی‌و تایبەت بی بە شانۆوە...

پ :- چ گۆرانێك بەدی دەکەی لە پێش کەوتنی ئافرەتی کورد لەسەر شانۆکانی کوردستان؟

و:- بەرای من گۆرانکاری‌یەکە بەردەوامی تێدایەو کۆمەلێك ئافرەتی لاوی رۆشنبیرو باوەرپێ کراو بە پەروشەوە بەگیانێکی لە خۆبوردنەوە هاتوونەتە بواری هونەرەوەو راستگۆیانە دەیانەوێت شۆرشێکی گەورەی هونەری بەرپا بکەن و ئەو دروشمە پیرۆزە بەکۆمەلانی خەلك



بگەیەنن ، ئەمانە دلخۆشکەرن بەمەرجێ هاوکاری‌و پشتگیری بکرێن و خواست و ئارەزوویان رەچاو بکرێت و دەرگایان بۆ ئاوەلە بکرێت، وابزانم کەس لە مالی گونجاوو خۆش راناکات.

پ :- پەیمانگای هونەرە جوانەکان.. لەسەرەتای دروست بوونیەوە تا ئیستا، بەرێزتان لەوێ مامۆستایەو رەنجێکی درێژخایەنی داوە بۆ پێ گەیاندنی قوتابیان.. بەلام بەداخەوە زۆر لەو قوتابیانەی پەیمانگاتەواو دەکەن ون دەبن و جارێکی تر لەسەر شانۆ نابینرێنەوە.. باشە ئیتر ئەم رەنجە لەپێناوی چی‌دایە؟

و: لەم حالەدا خۆم بە رەنج خەسار نازانم، من دەلێم لە«٣٠» قوتابی«٥» قوتابی بیبێتە هونەرمەند بەکارێکی زۆر چاك دەشکێتەوە... ئەو قوتابیەی هونەر



خەمی گەورەی بێ ئەوا بێ سێ‌و دوو پێی دەلێم لە ئیستاوە هونەرمەندە، بەلام ئەوەی بەنیازی تر دێتە پەیمانگا رەنگە ئەنجامەکەی پەشیمانی بێت...

پ :- دەوری مامۆستا چی‌دەبێ لە پێ گەیاندنی قوتابیان دا؟

بێ گومانم مامۆستای دلسۆز دەوری کاریگەری دەبێ، ئەو کاتەی من قوتابی بووم مامۆستاکەم یەکەم هاندەرم بوو، هەر مامۆستا(ئیبراهیم جەلال)بوو وەك باوك فێری جوانترین پەروەردەو خۆشەویستی هونەری کردم.. ئیستاش رێگەی ئەو لەفێرکردن دا بە راسترین رێگا دەزانم..

پ :- مامۆستا گیان ماوەی هەشت سال لە ئامادەیی سلێمانی کچان بوویت .. لەو کاتەدا چۆن هونەرتان فێری قوتابیان دەکرد؟

و:- ئای کە سانێکی خۆش بوو..

ئەوکاتە قوتابی‌یەکان زۆر حەزیان بەهونەر دەکرد منیش هەموو تواناییکی خۆم خستبوەکار، ئەوەبوو تیپی مۆسیقامان پێك هێناو تیپێکی شانۆشی، بەهەولی قوتابیان کۆمەلی چالاکی سەرکەوتوومان پێش کەش کرد لەو میهرەجان و ئاهەنگانەی لە شاری سلێمانی‌و بەغداد ساز کران و هەموو جارێکیش سەرکەوتنمان بەدەست دەهێنا.

پ :- دوا پرۆژەی هونەریتان؟

و: خەریکی خۆ ئامادەکردنم لەشانۆیی «هەنگوین»نووسینی مامۆستا(عومەری عەلی ئەمین) پێشی بەخوا دەیکەمە دەسکە گولێکی رەنگین بۆ میهرەجانی هونەری کوردی.

(ئەم هونەرمەندانەبۆ بەدیعە ئەدوێن)

عصمان فارس * بەردەوامە لە تێکۆشیان بۆ پەروەردە کردنی قوتابیان زۆر راستگۆیانە..

گەزیزە * مامۆستای بەرێزم خاتوو بەدیعەم دێتەوە یاد کە بە وانەی پەروەردەیی‌و رەوشتی جوان فێری کردین چۆن رێزی هونەرو هونەرمەندانمان لەلابێ.

اسماعیل هەورامی * یەکێکە لە دامەزرێنەری پەیمانگای هونەرە جوانەکان.

نیگار قەرەداغی * پەروەردەی مامۆستا بەدیعە. . مامۆستا بەهنامم دێنێتەوە یاد قوتابی تا خۆی نەبی بەمامۆستا نازانێ مامۆستا بۆچی هەندێ جار توندو تیژە لەگەلی

میدیا بێگەرد *چێی شانازی‌یە ،کورد ئافرەتێکی بەتوانای وەك مامۆستا بەدیعەی هەبێت.

گێلاس محی الدین * نمونەی ئافرەتی کوردە..

ژیان صالح * زۆر کۆت و پێوەندی شکاندوە تاوەك ئافرەتێك خۆی بسەلمێنێ.

● نەهرۆ سالح دەلۆ ●

# هونەری شێوەکار

## لەنێوان ڕەسەنایەتی و لاسایی کردنەوەدا

مێژوو بەگشتی، مێژووی هونەریش بە تایبەتی ئەوەی سەلماندووە کە یەکەمین نووسینێ پەی پێ برابێ و مرۆڤی کۆن نووسیبێتی، بریتی بووە لە وێنە کێشان.. وێنەی سەر ئەشکەوتەکان بەڵگەن بۆ ئەوەی هونەری شێوەکار (پلاستیکی)، بام بەشیوەیەکی سەرەتاییش بووبێ، لەگەڵ پەیدابوونی مرۆڤ دا هاتۆتە ئاراوە.. هاوڕێ و هاودەمی ناو ئەشکەوتی مرۆڤی کۆن بووە. زمانی ئاڵ وگۆڕ کردنی زانیاری و لێك تێگەیشتن بووە. ئەرکی زمانی بینیوە.. وێنەکێشانەکەیش پێویستی ژیان هێناویتی یە ئاراوە پەیوەندی بەتینی بەژیان و گوزەرانی مرۆڤی کۆنەوە هەبووە. ئەو وای بۆچووە ئەگەر وێنەی شێرێکی کێشا ئیتر دەتوانێ ئەگەر بۆسبەی بەرەوڕووی بۆوە بتوانێ بەسەری دا زاڵ بێ و ڕاوی بکات کەواتە ئەو وێنەکێشانەی سەر ئەشکەوتەکان هێزێکی دەروونی و وزەیەکی مەزنی پێداوە. سرووشی ئەوەی پێبەخشیوە کە دەتوانێ بەسەر ئەو دروندەیەدا زاڵ بێ.. کە دەکاتەوە زاڵ بوون بەسەر سروشت دا.. وەکوتریش ئەم وێنەکێشانە پەیوەندی بە ژیان و دەرامەت و بەرهەم هێنانی ئەو قۆناغەوە هەبووە.. دوورنییە بۆ ئەوەیش بووبێ زانیاری پتر لەسەر ئەو گیاندارانە پەیدابکات و لێیان بکۆڵێتەوە.. دیارە هونەر بەرێگەیەك حساب دەکرێ لەو ڕێگایانەی هۆشیاری و زانیاریمانی





پێ زیاددەبێ و وەك زۆر ڕێگەی دیکە.

مەسەلەی سوودوەرگرتن لە تاقیکردنەوەکانی ڕۆژئاوا کارێك نییە بەتەنیا نووسەرو هونەرمەندانی کورد کردبێتیان. بەڵکو کارتێکردن و کاریگەری هونەری ڕۆژئاوا گەیشتۆتە قووڵایی وڵاتانی ئەمریکای لاتین و بێشەکانی ئەفریقا.

ئەگەر مەسەلەکە سوودوەرگرتن بێ لە قوتابخانە جۆراوجۆرەکانی ئەورووپا، ئەوەیان سەربەستی یە.. سەربەستی گەڕان و پشکنین بۆ پەیبردن بە نهێنی یەکانی هونەر ئاشنابوون بە ڕێبازە نوێکان.. بەڵام ئەگەر لاسایی کردنەوەی ڕووت بێ وەك (هەندێجار)بینەری وریا لەسەردانی پیشانگاکانی لای خۆمان دا پەی پێدەبات و بەسەریان دەکاتەوە ئەوەیان فۆتوکۆپی یەو.. کارێکی شایستەنییە.. ژێردەستەیی هونەری یە.. بوونە پاشکۆی هونەری گەلانە.. لە کاتێك دا پێویستە ئێمە هونەری ڕەسەنی خۆمان هەبێ وابێ وەك هونەری دەمامکەکانی ئەفریقا بناسرێتەوە.. ئەگینا ئەو لاسایی کردنەوەیە تاساندنی هونەری خۆماڵی لەدوایەو زات نەکردنە بۆ دامەزراندن و بەپیرەوە چوونی هونەری ڕەسەن.. کارێ دەکات هونەری کوردیش سەرپێ نەکەوێ.. ئەگەر مەسەلە نوێخوازی و تازەبوونەوەبێ.. کە ئەمەیان کەس لاری لێی نییەو ناشتوانێ بێتە لەمپەر لەبەردەمی دا بۆچی ئەو نوێخوازی یە شوناسنامەی خۆمانی لەگیرفان دا نەبێ؟! خاوەنی شوناسنامەی زاتی و مەوزووعی نەبێ و لەسەر دەستی هونەرمەندانی خۆمان دا لەدایك نەبێ؟

هەن بیروڕای ڕەخنەگرانی ڕۆژئاوا بەبیروڕای ناوکێیە پیرۆزەکان دەزاڵ دەبێ لێرەوە مل کەچیان بن.. لەبەر ڕۆشنایی بیردۆزەو بۆچوونەکانی ئەوان دا فڵچە بەدەستەوە بگرن.. ئەوانەی بیردۆزە(تیور) ئەدەبی و هونەری یەکانی ڕۆژئاواکوت مت وەك بیردۆزە زانستی یەکان سەیردەکەن ئەوا بەهەڵەدا چوون.. زانست و ئەدەب لەم دووڕیانەدا لێك جیا دەبنەوە.. ئێمە لە ئاستی بیردۆزەکانی نیوتن و ئانشتاین دا مل کەچین، چونکە زانستن و سەلمێنراون.. بەڵام بیردۆزە هونەری و ئەدەبی یەکانیان زۆریان زانستی نین و لەسەر هەموو زەمینێك و لەهەموو شوێنێك دا هەمان سەرەنجام بەدەستەوە نادەن، بگرە یەك ئەوی دیکە ڕەت دەکاتەوە!.. بە دەگمەن ڕێ دەکەوێ دوو فەیلەسووفی جوانیی لەلای ئەوان لەسەر مەسەلەیەك ڕێك بکەون.. تەنانەت لە ڕۆژئاوا لە هەر ڕەخنەگرێ یاخود توێژەرەوەیە داوابکەی پێناسەی شیعرت بۆ بکات، ئەوا دڵنیابە هەریەکەو پێناسەی تایبەتی خۆی هەیە، کە لەهی هاوڕێکەی جیاوازە.. شیعر کە زۆر بەتەمەنترە لەهونەری تەشکیلی نوێ لەسەر پێناسەکردنی ڕێك ناکەون و ناکۆکن، ئیتر چۆن لەسەر هونەری شێوەکار ڕێك بکەون کە ڕەنگە بەهەڵەدا نەچووبم ئەگەر بڵێکم لە هەموو لقەکانی دیکەڕاڤەو لێکدانەوە زیاتر (تفسیر) هەڵ دەگرێ.

میللەتانێ، کە ماوەیەکی زۆر ژێردەستەبوون.. ژێردەستەی ئیمپریالیزم پێویستییان بەگەڕان و خۆپەروەردە کردنە تاکو بینە خاوەنی شوناسنامەی خۆیان.. چونکە ئەوان زۆر بەهێزن و ئەمانیش ست و بێهێز.. بۆیە ئەو نەتەوانەی کاتی خۆی ژێردەستەبوون.. لەنێوان دواکەوتنی نەتەوایەتی و پێشکەوتنی ئەوان دا دەناڵێن.. لێرەوە هونەرمەندی هوشیار ئاگاداری ئەومیە ڕەسەنایەتی خۆی بپارێزێ..

● محەمەد فەریق حەسەن ●



# خونچە گوڵی تیپی شانۆی مەخمور...

«نشتمان حەمەدەمین حوسین» یەکێکە لە ئەکتەرەکانی تیپی شانۆی مەخمور، ئەم کیژۆڵە جوانکیلە ساڵی «١٩٧٨» لە شاری مەخمور چاوی بۆ جیهانی شانۆ هەڵێناوەو ئێستا پۆلی چوارەمی سەرەتایی یە لەمەخمور، بەشداری چەند شانۆگەرییەکی کردووە لەوانە: «ئەگەر بایەو. ئەگەر باران»و«دایکی شەهید»و«کاوەی ئاسنگەر»، بۆ چەند دەقیقەیەك لەگەڵی دانیشتین:.

+ ئەم کاتەت باش..

* ژیانت باش...

+ کێ هاندەرت بوو کەوا ببیتە (ئەکتەر)؟

*«موحسن شوانی»ی برام یەکەم کەس بوو دەستی گرتم و بردمی بۆ تیپی شانۆی مەخمور.

+ شانۆ جێ دەهێڵیت..؟

* نەخێر شانۆ خۆشەویست و هاوڕێی ژیانمە!!

+ ڕەنگینت دیوە..؟

* بەڵێ زۆر جوانە.. پڕیەتی لە وێنەی منالانی ئێسك سووك.

+ سوپاس.. هیوای بەردەوامیت بۆ دەخوازین..

* ئەمێش سوپاس، بەلام وێنەکەم لە ڕەنگین بلاوبکەوە!

+ سەرچاو...

● غەفوور مەخمووری ●

# بوکی نەورۆز

● - عەبدول شارباژێری - ●



کوردستانم چەندە شۆخە
جوانی کێوو دەربەنی.
ئای لە خۆشی ئاوو هەوای
تاڤگەو چەم و بەندەنی.
کوردستانم لانەی کوڕنە
جێگای شێر و کاوەی مەردە.
خاوەنی جەژنی نەورۆزە
ڕۆژی شادی گەل و هۆزە.
کوردستانم بەباس کردن

جوانی و خۆشی دوایی نایە.
بوکی نەورۆزی خەیاڵم
دڵم بەعەشقی شەیدایە.

- ١٩٨٨ -

# له كه‌له‌پووری نه‌ته‌وایه‌تیمانه‌وه









ئه‌گه‌ر بروانینه وێنه‌ی ئه‌م چه‌ند پارچه‌ی كه‌له‌پووری نه‌ته‌وایه‌تیمان و سه‌رنج بده‌ین ئه‌وا جڵه‌وی خه‌یاڵمان به‌رده‌بێت و ده‌گه‌رێینه‌وه ناخی مێژووی باب و باپیرانمان. جه‌سته‌مان به‌جێ ده‌مێنێ‌و بیرمان ده‌كه‌وێته خولانه‌وه به‌ناو لاپه‌ره شاراوه‌كانی پڕ له قاره‌مانی‌و ده‌ست ره‌نگینی‌و كارامه‌یی گه‌له‌كه‌مان.

كۆمه‌ڵێك گۆسكه (گۆزه) جێگای نه‌بوونی به‌فردان (سه‌لاجه)ی ئه‌م رۆژگاره پڕده كه‌نه‌وه.. یه‌كێك بۆ پاراستنی رۆنی ئاژه‌ڵ و ئه‌وی تر بۆ قاورمه ئه‌وی تریان بۆ ته‌رمه‌سازو شیلم به‌ترش ئه‌وه‌كه‌ی تریشیان بۆ ئاوهێنان و ئاو تێدا خواردنه‌وه.

مه‌نجه‌ڵێكی زنجیرداری زل بۆ شیولێنانی شیوی جێژنان و ژن هێنان و پرسه‌و هاتنی میوان و.. هتد خۆی له خۆی‌دا مانایه‌كی زۆر گه‌وره ده‌به‌خشێ.. چاوفراوانی‌و خانه‌دانی‌و نانده‌ر یتیی باب و باپیرانمان پێ راده‌گه‌یه‌نێت. یه‌ك بوون به‌یه‌كه‌وه ژیانی خێزانی ئه‌و سه‌رده‌مه ده‌خاته روو. كۆمه‌ڵێك له‌گه‌ن و مه‌نجه‌ڵ و مه‌سینه‌و ده‌ست شۆریش ژیانی ساكاری مرۆڤی ئه‌و سه‌رده‌مه نیشان ده‌دات. خۆبوونی سه‌ماوه‌ریش تاكو سه‌رده‌می ئێستاشمان وه‌كو نه‌ریتێكی كۆمه‌لایه‌تی له زۆربه‌ی ماڵه‌كان دا هه‌ر ماوه‌ته‌وه، به‌ڵام به‌كارهێنانی كه‌م، تا زۆر ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ په‌یوه‌ندیی ئه‌و خێزانه به پێی نه‌ریتی كوردهواری

تێبینێ :- ئه‌م وێنانه‌ی سه‌ره‌وه‌م له دێرینخانه‌ی قه‌ڵای هه‌ولێر گرتووه.

● كه‌مال سه‌عدی●

# به ئیمزاکەت خۆت بناسەوە






● شێرکۆ أبوبکر بێ باك ـ سلێمانی ـ بەحاجی کاکە احمد سوێندت ئەدەم بەحەیاتت ئیمزای وات دیوە بێجگە لەم شەرە پشیلەیەی خۆت .



● مجید صالح مجید ـ کەرکوك ـ سەرت لەخۆت شێواندوە ، ئەوەندە ئاڵۆزی بە هیچ نابی . ئاگات لە خۆت بێ .



● صباح ستار غەمبار ـ هەولێر ـ تۆ زۆر لەخۆت رازیت، گیروگرفت سەری لێ تێك داوی حەزلە خۆدەرخستن ئەکەیت .



● عبد الکریم نصرالله فتح الله ـ سلێمانی ـ حەز لە لاسایی کردنەوە ئەکەیت رِق لەدڵی، دڵیشت ناسکە .



● نەوزاد اسماعیل ـ هەولێر ـ دل ساف و بەرەحمی ، سادەی خۆتت زۆر خۆش ئەوێ ، حەز بە ئاژاوە ناکەیت .



● هۆشیار عمر فتاح ـ کۆیسنجق ـ کابرایەکی زۆرە خەیاڵ و ئاوات پرِی . بەڵام زۆری لێك دەیتەوە .



● توفیق حمەأمین صالح ـ کەلار ـ دڵ ساف بەرحمی ، هەندێ گیروگرفتت هەیە، سەری لێ تێك داوی .



● برهان عمر ـ سەرچنار ـ حەز لە موڵك ومالی زۆر ئەکەیت سادەی بەڵام بیرو خەیاڵت زۆرو خاوە .



● سلێمان احمد شیروانی بەخرکە ـ کابرایەکی گرێ گرێ یاوی‌و هەمووگیانت بوەتە گیروگرفتو سەرت لە خۆت تێك داوە .



● ڤیڤیان ظاهر سعید ـ هەولێر ـ ئێوە خۆش بەختن ، دڵ ساف و سادەن ، بەڵام تۆزێ خۆپەرستی .



● شکریە محمود حسن ـ سلێمانی دڵ ساف خۆش ئاوات و پاشەرِۆژ رِووناکی سادەو بێ ئەرکی .



● مهاباد محمد رشید ـ سلێمانی ـ نازانم تۆ بۆ واخوتت وا لێ کردووە، خەریکە تووشی گرێی دەروونی ئەبی، سەرلەخۆت تێك مەدە .



● دڵشاد محمدجواد ـ هەولێر ـ سوێندت ئەدەم بەقەلاکەی هەولێر، ئەمە ئیمزایە یان نوتەی مۆسیقا؟ .



● ابراهیم قادر چۆمانی ـ هەولێر ـ ئاواتت ئەوەندە زۆر بوون ، نازانی چی‌بکەیت، حەزلە خۆدەرخستن ئەکەیت .

ئیمزا

ناو — — — — — — — — — — — —

ناونیشان — — — — — — — — — — — —



حارس محمد

# تۆپـ پێی یانـەی هەولێـر یەکێکە لە تیپـ ...ـراق ونومێدواریشم یانەی سلێمانی بگاتە ...ڕیزی یانە پلە یەکەمینەکانی

لەشاری موسلی دوو بەهارە وشاری پیامبەرانی خوای گەورە، بەخزمەتی (حـارس محـمـد) یاریـزانـی هەڵـبـژاردەی عێـراق و یانــەی (الطلبـة)لـە تۆپی پێ گەیشتم وئەم چاوپێکـە وتـەم لەگـەڵ سازدا، وامـپـیش بەرێـزەوە پێشـکـەشی خوێنــەرانی گۆڤـاری ڕەنـگـینی خۆشەویستی دەکەم . .

● یەکـەم یاریت لەگەڵ هەڵبژاردەی عێراق دا . . . ؟!

- یەکـەم یاریم لەگـەڵ هەڵبـژاردەی عێراق دژی هەڵبژاردەیفنلندا یاری کردو توانیمان ئەو یارییە(٢ - سفر)ببەینەوە .

● هۆی چیبـوو لەگەڵ هەڵبژاردەی عێـراق لە کۆتـایـەکـانی خولی ئۆلۆمپیادی سیئۆل یاریت نەکرد . . ؟

- هۆیــەکـەی دەگـەڕێتـەوە بۆ ئازار پێگـەیشتنم لە پاڵاوتنی ئۆلـۆمپـیادی سیئـۆل سـەرەڕای ئەم ئازار پێـگـەیشتنـەشم لە پاڵـەوانـەتی کەنـداوی عەرەبی یاریم کرد تاوام لێهـات ئازارەکەم کارێکی تەواوی تی کردم ونـەمتوانی چیتر لە یاری کردن بەردەوام بم، بەڵام ئێستـاکـە دوای ئەوەی بە تەواوەتـی چاك بوومـەوە گەڕامـەوە ڕیـزی هەڵبژاردەی عێراق .



● جمـوجـوڵـی وەرزشـی لە کوردستان چۆن دەبینی . . . ؟

- بەڕای من جمـوجـوڵی وەرزشی لە کوردستان گەشە سەندنێکی زۆری بەخـۆیـەوە بینیـووە چ لە بواری شەتـرنج وتـۆپی پێ بێت یاخۆ لە بوارەکانی تری وەرزشی .

● دەربـارەی یانـەی هەولـێـر لەتۆپیپێدا چی دەڵێی . . ؟

- بەڕای من تیپی تۆپی پێی یانـەی هەولێـر یەکێکـە لەتیپـە باشـەکـانی عێـراق، هەر چەنـد لەوەرزی ڕابـردوو بەختی لەگەڵ یاری نەبوو . وبەڵام هیـوادارم برایـانی یاریزان لە هەولێر لە جموجوڵی خۆیان نەکەون وزیاتر لەجاران هەوڵ وکۆشش بدەن .

● ئەی دەربـارەی تیپیتـۆپی پێی یانەی سلێمانی دەڵێیچی . . ؟

- ئومێـدوارم لە داهـاتـوودا بگـاتـە ڕێزی یانە پلە یەکەمینەکانی وەڵات .

● هەست بە چی دەکـەیت کە بە ڕێگـای گۆڤـاری ڕەنـگین خۆت بەخوێنەرانی کورد دەناسێنی . . ؟

- هەست بە دڵشـادیکی بێ پایـان دەکـەم و شانـازی بەوەش دەکەم کە وێنـەیێکی راستی خۆم پێشکەشی خوێنـەرانی بەرێـزی کورد بکـەم، هەروەهـا زۆر ڕێـزو سوپـاسیشم هەیـە بۆ جەماوەری وەرزش دۆستی کوردستان بەگشتی و شاری هەولێر بەتایبەتی .

● جگەلە تۆپی پێ حەز بەچی دەکەیت . . ؟

- خوێندنی قورئانی پیرۆز و تۆپی سەبەتە .

● خۆشترینی ئەو وەڵاتانەی کە بینیووتە . . ؟

- سەنگافورە .

● دەربارەی ئەمانە چی دەڵێی . . .

+ فرمێسـك ووریا : باشترین کچە یاریـزانـی کوردی شەتـرنجـە لە نیشتمـانی عەرەبیو وچـاوەڕێی چاکتری لێ دەکرێت .

+ سەرکـار عەلی خان : یاریزانێکی هێرشبەری لێ هاتووی یانەی هەولێرە .

+ تاریق عەبـدولـرەحمـان : گۆڵ تۆمارکەرێکی شارەزایە

+ ڕۆژنـامە نووسی : ئومێدوارم هەر ڕاستی بنووسن .

+ خۆشـەویـستی : گەورەتـرینیـان خۆشەویستی خواوپیامبەرە .

● دوا ووتەت . . ؟

- زۆرسـوپـاسی گۆڤـاری ڕەنگین و وجەنابت دەکەم بۆئەم ئەرك کێشانەو ئومێـدوارم گۆڤـاری ڕەنگین هەر لە گەشە دابێت .



● محمود خسرو کاوانی ●

# مەیموون و مەیموونەوان



کاتــی خۆی مەیــمــوونــەوان و ورچــەوان هەبــوونــە، کەوا مەیموون و ورچیان هەڵپەڕاندووە. کاتێــك ئەو زەلامــانــە، ئەو گیــان لەبــەرانــەیــان هەڵپــەڕاندووە مایەی شادیو خۆشــیی گەورەو درشــتــی خەڵکی بووە.. ئــەو مەیمــوون و وورچــانــە لەســەر ئەزمی گۆرانیو ڕەزمی دەفی دەستی خاوەنــە کانیــان زۆر جار بەجــووتــە کەوتــوونــەتــە هەڵــەکــە سەمــاو هەڵبەزو دابەز وەك دەی گێــڕنەوە ئەم شتە لەکوردستاندا باوبووە، بەڵام نزیکەی چل ساڵێك دەبێت ئەم دیــاردەیــە نەمــاوە.. بەم شێــوەیــە بەشــارو دێــدا گەڕاون و خەڵــکێکی زۆریــان لەخــۆیــان کۆکــردوتەوە وپارەو پوولیان بەچنگ هێناوە. لەهەمان کاتیشداهەندێکیان مەبــەستێکی تایبــەتیان لەپــەنایەوە هەبــووە.. ئەمــڕۆکــە سەر لەبەیانی ژنــەکــەم هەڵی پێچــام و پێی لێ کردمــە کەوشەوە، بۆبەچنگ هێنانی شیر بۆ ساواکەمان. کاتێك بە قەراخ خڕی خاســە لەشاردا ڕێگەم دەبڕی کابرایەکی ئەفەنیی سەربۆزم بینی، مەیــمــوونێــکی بەدووی خۆیــدا بەپــەتــك پەلــەکــێش کردبوو. خەڵکێکی زۆریش بەســەرسامیەوە کەوتبــونە دوویان.. منیش وەك ئەو خەڵکــە بەپەرۆشەوە کەوتمە دیقەت دانی ئەو مەیمــوونە چونکی پێشتر بەتــەنــهــا دووجــار مەیــمــوونم لەبــاخچــەی گیــانداراندا دیتبوو.. کابــرا زوو خۆی گەیــانــدە ئۆتــۆمــبــیــلەکــەیو، خۆیو مەیمــوونەکەی لەخەڵکی دەسبەتاڵی گاڵتــەجــاڕ ڕزگــار کرد. دووای نەختێــك ڕێ بڕین نیگــام بەڕووی مێــرد منــداڵێکــدا گیــرسایــەوە، کەلــەسەر شۆستەکەدا بەدیار قوتووە شیــرێکی گەورەدا دانیشتبوو. لێی نزیــك بوومــەوەو نرخــی قوتــووە شیرەکەم لێپرسیو وەڵامی دامەوە:

- دەیدەم بە(..) دینار..

نەختێك ڕووی خۆمم لێگرژ کردو ووتم:

- چۆن بەوەنــدەی دەدەیــت، لەکــاتــێــکــدا خۆی نرخــی (.....)ــە!؟ ئەویش مۆڕەیەکی لێ کردم و ووتی:

- گەر بەوەندەی دەیلێیت کریت من ئەمــەت بەبەلاش دەدەمێ ناچار لێم کریو بەکــوتــرە کوتــر ڕێگــەی ماڵم گرتەبەر.. بەخۆشحاڵیەکەوچوومە ژوورەوە. ژنــەکــەم بەرەوڕووم هات و بەڕوویــەکی گەشــەوە قوتوە شیــرەکــەی لێ وەرگــرتــم منیش یەکســەر لەجیــاتی هەمــوو شتێــك، باســی هەڵبــەزو دابــەزو ڕەوتی مەیمــوونــەکــەم بەخــۆشیــەکــەوە بۆ گێــڕایــەوە. ئەویش نەختێك سەری خۆی باداو ووتی:

- تۆجاری سەرەتا پێم بڵێ شیرەکەت بەچەند کڕیوە؟

ــبە(....) دینارم کڕیوە..

- چۆن.. چــۆن!؟ گوایــە بۆبــاسی مەیموونم بۆدەکەیت!

بۆبــاسی خۆت ناکــەیت کەبەم نرخە گرانە ئەم شیرەیان پێ فرۆشتوویت و کڵاویان لەسەر ناویت!؟

کەگــوێم لەم قســانــەی ژنەکەم بوو، هەردوو چاوم پەڕینــە پشــتی سەرم زۆر بەتووڕەییەوە نەڕاندم بەسەریاو ووتم:

- تۆ چەنــد ڕۆژە منت هەڵپێچــاوە، بەناخێری گیانت ئێستایش وەهام پێ دەڵێیت!؟

زیاتر بەروومدا تەقیەوەو ووتی:

- پێم ووتی بیکــرە بەڵام نەك بەوەندە گران.. گــوایــە تۆ مانگــانــەکــەت چەنــدە، تابــەوەنــدە گران شیــر لەمنــداڵــە وردکــە بکــڕیت..! ئێستاکێ بیدەم بەعەردا..؟

منیش زیاتر حیدەتم بەخۆمداو ووتم:

- نەخــێــر.. ئــەگــەر نارازیــت خۆم دەیــدەم بەزەویدا.. ئیتر لەمن قــسەیەك و لەو قسەیەك، قوتووەشیر بەربــووەوەو کەوتــە سەر زەویــەکــەو هەرچــیــەکــی تێــدابــوو ڕژا..

هەردووك سەرســام بووین و واقمان وورمــا کەبینیمــان لەجیــاتی شیــری ووشــك، ووردە ئارد بەزەویــەکــەدا بڵاوبــووەوە..! لەم کاتــەیشدابوو کۆرپــەکــەمان لەنێو لانکەکەیدا دای لەزیــرەو گریە.. ژنەکەیشم لە پێشو زیاتر هاواری لێ کردم:

- سەیــر.. سەیــر..!؟ خۆ ئەو کوڕە نەحــلەتیــە قوتــووەکــەی بەتــاڵ کردووەو، لەجیــاتی شیــر ئاردی تێ ئاخنیــوە..!؟بــەم شێــوەیــە هەڵی خەڵەتاندوویت و گیرفانی بەتاڵ کردوویت..!

منیش دەمم چوو بەتــەڵــەی تەقیوداو هیچم بۆنــەووتــرا.. ژنەکەیشم بوو بەپشکۆیەك ئاگرو، هاواری لێ کردم:

- هەر ئێــستــا خۆم دەپێــچمــەوەو، ماڵ و منداڵت بۆبەجێ دەهێڵم.. بەڕاستی دەستم چوو بەزاخــاو نەم دەزانی چی بکــەم.. هەرچــەنــدم کردو کۆشا نەم توانی ژنەکەم سارد بکەمەوە.

ساواکــەیش چووبوو بەڕق داو یەك بەخــۆی دەی نەڕاند. بەپەلە ژنەکەم خۆی پێچــایــەوەو جانتــاکــەی گرت بەدەستەوەو بەرەو دەرگای حەوشەکە کەوتە ڕێ.. هاوارم لێکرد:

- کچێ ژنــەکە بۆوەك مەیموون تێت تەقاندو، ماڵەکەت بەجێ هێشت؟

ئەویش ئاورێکی لێدامەوەو ووتی:

- تۆ وەك مەیــمــوون یاریــان پێکردیت و هەڵیان خەڵەتاندیت و، بەپارەیەکی زۆر ئاردیان پێ فرۆشتیت..!

لەدەرگــای حەوش چوو بەودیــواو، ماڵــەکــەو ساواکەی بەسەرمدا بەجێ هێشت. منــداڵــەکــەیش لەپێشــوو زیــاتــر دای لەزریکــە زریــك و گریــان.. منی بێچارەیش لەنێوە ڕاستی حەوشــەکــەدا مەیموون ئاسا دەستم کرد بە هەڵبــەزو دابــەزو دەم ووت: من.... تۆ... ئەم.. ئەو؟!

● معتصم ساڵەیی ●



# ئیمەو دەست و خامە رەنگینەکان

نەك لەمێــژووی رۆژنــامــەنــوسی کوردیدا بەلکــو لەرۆژنـامەنـوسی عیراقیشدا وا روینەداوە گۆڤارێك بەوادەی سالێـك ژمارەکانی لە پێنج هەزار دانەوە بگاتە دەو بیست و سی و بیـەوێ بگـاتـە چل و پەنجاش بۆی نەلوێ و، نەبوەو نەکراوە گۆڤارێك هێشتا لەچاپخانەیەو پێشـەکی پارەکی بدرێ، ئەمـە مایـەی شانـازییە نەك تەنهـا هەربـۆ دەزگـای رۆشنبیـری و بلاو کردنـەوەی کوردی و بەس بەلکـو بۆ رۆژنامەنوسی کوردی و بۆ ئەو هەمـوو نوسـەرو ئەدیبـە دلسـۆزانـەی کە بەوشـەی رەنگین و بەنوسینی پاکی کوردی پاڵ پشتی گۆڤارە کەیانن.

پێـوەری پەرەسەندن و پرشنگدانەوەی هەر بلاوکراوەیە لە دوو سەرەوە ئەپێورێ (یەکەم) لەو نامەو نوسراوانەوە کە بۆی ئەنێـردرێت و (دووەم)لـەسـەرتـاپا فرۆشتن و نەگـەرانـەوەی هیـچ دانـەیـەکی، جا ئەم گۆڤـارە لەم مەیـدانـەدا گۆی هونـەری بردوەتـەوەوچوەتـە ناو دڵ و دەرونی جەمـاوەرەوەو تاسـوقی خوێنـەری شکـاندوەو ژن و پیـاو گەورەو بچـوك چاوەڕێی دەرچونی گۆڤاری خۆش و بەتامی رەنگینن.

بەپێی ئەوستـونـەی لەژمـارەی پێشـودا بلاومان کردەوە لەمـاوەی سالێکـدا هەربـەپـۆستـە (٥١٨٨)کاغەزمان بەدەسـت گەیشـتـوە جگـە لە (٥٠٠)کـاغـەزێـك بەدەستی بۆمـان هاتـوە، (خەرمان بەرەکەت، خێر و بەرەکـەت)ی پێ ئەوێ، گۆڤارێکی کۆرپە لە سالێکدا نزیکەی (٦٠٠)نوسەرو ئەدیب بەسەری بکەنەوەو پاڵ پشتی بن ئەمە نیشای سەرکەوتن و پێشکەوتنێتی.

ئێـمـەی دەست و دایـەرەی ئەم گۆڤارە شانازی بەو رێز لێنــانــەی ئەوهــەمـوو نوسـەرو ئەدیب و جەمـاوەرە ئەکەین، بێ ئەوەی لەخۆمان بایی بین و لەپێـتی خۆمان دەرچین دەست لەســەر سینـگ لەخزمـەتی هەمـوو نوســەرو خوێنــەرێکی رەنگین ئەوەستین وداوایـان لێ ئـەکـەین لەگەڵ گوڵ باران کردنماندا رێنماییمان بکـەن و پێشنیـازو تێبینیمـان بۆ بخەنەروو تاسودتان لێوەرگرین.

بەرێــزان ئێمــە هەمـوو رۆژێ دەیـەهـا نوسـراومـان بەدەست ئەگـات داوامـان لێ ئـەکـەن بەهـاورێیی رەنگینیـان دابنێین، برایان، خوشکان ئێوە هەمووتان هەڤـاڵ و هاورێی گۆڤـاری رەنگینن پێمـان ناکـرێ و دەرفـەتمـان نییـە لە هەمـو ژمارەیەکدا ناوی هەموتان ونـوسینـەکـانتـان بلاوبکـەینـەوە مەگـەر سالی یەك دووژمارە بۆ ئەم مەبەستە تەرخان بکەین ئەمەشمان بۆناکرێ.

لەشارو دێهـات و کۆمـەڵگـاکـانـەوە سەدان لە پارچە شیعـرو پەخشـانی بەبـالاّ بڕینی رەنگینمـان بەدەست ئەگـات،لە بلاو نەکـردنـەوەیـان داوای لێبـوردنتـان لێ ئەکەین، وائەمجارەش چەندکۆپلەو چەندرستەیەك لە هەست و نەستی هەنـدێ لەو خوشـك و بـرایـانە بلاوئـەکـەینـەوەو داوای لێبـوردن لەوانیتر ئەکـەین، ئەوەش بزانن ئێمە زیاتر دڵی برایانی ناوکۆمەڵگاو شارە تازەکان بەجێ ئەهێنین:

ـ لەشــاری تازەی ی(حـاجی ئاوا )وە کاك (کمـال شوکت حمەخورشید)ئەڵێ:

چەپکێ گوڵی رازاوەو جوان
تازە خونچەی باخچەی ژیان
تێکەڵ بەسروشتی بەهار بەسۆز
لەگەڵ بلێسـەی ئاگری نەورۆز
ئەم هەموو رێزو سلاوە
پێشکەش بەو گۆڤارەی رەنگیناوە

ـ لەگوندی (سەرکەپکانەوە)کاك (عبدالرحمن حمد عبدالله)ئەڵێ:

گۆڤاری رەنگین چەندە رەنگینی
دەرمانی دەردی دڵی خەمگینی
وەك وەرزی بەهار تۆ رەنگاو رەنگی
وەکو کچی کورد پاك و قەشەنگی
باس باسی تۆیە لەگوندو لەشار
دەڵێن رەنگینە باشترین گۆڤار

ـ لەکـۆمـەڵگـای (ئـەڵـلایی)نـاوچـەی بازیـانەوە کاك عوسمان محمد ئەڵێ:

سەیری گوڵم کرد گەڵێك سەنگینە
تیشکی ئەهاویشت زانیم رەنگینە
(رەنگین)رەنگینیت بلاوکردەوە
رووی زەردی ئێمەی رەنگین کردەوە

ـ لەگوندی (بێرسفی)قەزای زاخۆ کاك (صلاح الدین سلیمان سندی)دیبێژت:

ـ لە(رەحـیـم ئاوای)کـەرکـوکـەوە کاك (رضـاکـاکـەحمـەسعیـد)ئـەڵێ(هەتا بلێی گۆڤارێکی بەنـرخـە، لەدڵی هەمـوو خوێنـەری ئازیـز بەراستی جێگـەی لەدڵی هەموو نیشتمانیە رووەرێکدا کردوەتەوە هیوای سەرکەوتنی بۆ دەخوازین..)

ـ لەپاریز گەها (هەڤلیر)کاك (شەهاب نوری)ئەڵێ:

رەنگین گولا گەش و جانە
ئەڤ یا بە دلی هەڤالانە
نێ خوشتەڤیا مەهەمیانە
ئەڤ گوڤارا مە کوردانە

ـ لەگـەرەکی صابـونکـەرانی سلێمانییەوە کاك (فلاح صالح محمد)ئەڵێت:

ئەی رەنگینی رەنگاو رەنگ
جوانترین لەکچی شۆخ و شەنگ
گۆڤاری قەشەنگ جوان و رازاوە
لە کوردستاندا ناوت بلاوە
یاخوا لەلامان رەنگت بمێنێ
بەتۆ کوردستان پەرە دەسێنێ

ـ لەگـەرەکی(تـاشتی) شاری هەولێـرەوە کاك (یوسف یونس خدر)ئەڵێت:

گوڵێك پەیدابوو لەم کوردستانە
گەلای دەکرێتەوە هەموو مانگانە
بۆنی ئەم گوڵە دنیای داگیرکرد
دەردی هەموو نەخۆشی تیمارکرد
ناونیشانەکەی ناوی رەنگینە
پڕ لەمەعنایە یەکجار سەنگینە

ـ لەنـاحیـەی(زەرایـەن)ی پارێزگای سلێمانییەوە کاك (سیروان عبدالله محمد)ئەڵێت:

هەڵم گرت پێنوس نوسیم نامە
بۆ ئەم رەنگینە شرین و بەتامە
رەنگین ئەی گوڵی باخی کوردستان
کاتێ کەچێنرای لە باخچەی ژیان
بۆنت گەیشتە هەموو نیشتمان
هەموو خوێندەوار بەتۆ بو شادمان




رەنگین بشکوژەکا بیهن خوشە
شەمالکە کارو هن و گەشە
گرنژینا هەردوو لیڤانە
خوناڤا رویێ پەریانە
ڤینا دلێ هەمی خویندەڤانا
پەیڤا ل ناڤ هزر هوزانڤانا

ـ لەگەرەکی (سەرمەیدان)ی هاوینە هەواری شەقلاوە کاك (یوسف محسن)ئەلێ :

ئاسا بووك و زێدە جوانی
تاقە هیوای کوردستانی
گوڵی باغی دلدارانی
میوەی خۆشی خوێنەرانی
تۆ بەفراوی تۆ کوێستانی
تۆ رەنگینی تۆ گەرمیانی

ـ لەتازە خورماتووەوە کاك (کامەران عبدالخالق دەلو)ئەلێ :

گۆڤاری رەنگین رەنگینی خۆمان
هەروات ببینم بمێنی بۆمان

جێی شانازیت و هەر مەدحت ئەکەم
تاکە گۆڤاری بەرزی ئەمرۆمان

ـ لەگەرەکا (عطشانە)ی پاریز گەهامیسل کاك (شکری محمدعلی)دبێژت :ـ (ئەز سلاڤ وریزێت خو دنیڤەکا دلێ خو دکەمە دیاری بو هەمی کاربەدەستێت گوڤارا رەنگین ، ب راستی رەنگین گوڤارەکا دەنگ ڤەدەرە دناڤ هەمی باژێرێت کوردستانێ وە خزمەتەکا بێ نڤی دکەت بو خویندەڤانێ کورد. . )

ـ لەسەنگەسەرەوە کاك (محمد عبداللەحمد)ئەلێ :

رەنگین زمانی گەرمی ولاتم
ساڵی دوازدەجار من بەتەماتم
بەهاران وێرای شنەی بای شەماڵ
بەفری خەمی دڵ تۆ دەدەی رِاماڵ

ـ لە چەمچەماڵەوە کاك (عارف کەریم قوربانی)ئەم چوارینەی بەدیاری بۆ ناردوین :

لە ئاسۆ هەڵهات گۆڤاری رەنگین
روونی کردەوە سەرتاپا زەمین
رازاوەتەوە بەوشەی جوان جوان
لەبۆ میللەتی کوردی خوێن شیرین

ـ لەرەحیم ئاوای کەرکوکەوە خوشکان (جەمیلە خالدو پەروین صالح)ئەلێن :

دیسان ئەم جارەش رەنگین هاتەوە
بە بەرگێکی جوان وانە خشایەوە
بەهونەرو بەهرەی جوان وارازایەوە
بەبەرگی رەنگین وا رەنگایەوە

ـ لەکۆلێجی یاسای زانکۆی صلاح الدینەوەکاك عبدالعزیز عبدالرزاق ئەلێت :

بەراستی رەنگین هەرخۆت رەنگینی
روناك کەرەوەی تاریکی ژینی
لەسایەی خامەی دڵسۆزەکانت
یاخوا تاکوسەر بۆمان بمێنی

ـ لەگەرەکی(جوتکانیان)ی(قەلادزێ)وە کاك(خالد عبداللە)ئەلێ :

کام ئاواتە گەلێ بەرزە کە هی ژینە
لەم گوڵزارە کام گوڵ جوانە
سوورە، زەردە، مۆرە، شینە
کامەیان بایەخدارترە دەی ببینە
چەپکێك هەیە لەناویاندا
خاوەنی تیشکی زێرینە
رۆشن دەکات دڵی تاریك
بێ شك گۆڤاری رەنگینە

● سکرتێری نووسین ●






ناو ـ شاهین عباس مصطفى
تەمەن ـ ١٥ساڵ
ئارەزوو ـ وەرزش
ناونیشان ـ کفری، ناوەندی مکاسب



ناو ـ معاذ مجید هەری
تەمەن ـ ١٨ساڵ
ئارەزوو ـ شیعری فولکلۆری
ناونیشان ـ هەولێر ـ ناحیە خەبات



ناو ـ بایزمەولود قەسرۆکەی
تەمەن ـ ٢٤ ساڵ
ئارەزوو ـ شیعر و گۆرانی
ناونیشان ـ شەقلاوە ـ کۆمەڵگای باسرمە



ناو ـ عەلی عبدالرحمان عەسکەری
تەمەن ـ ٢٠ ساڵ
ئارەزوو ـ یاری تۆپی پێ
ناونیشان ـ چەمچەماڵ ـ
گەڕەکی بێ کەس ژمارەی خانوو ٥٤٤



ناو ـ هاوژین ئەسعەد
تەمەن ـ ٢٠ ساڵ
ئارەزوو ـ نامەگۆڕینەوە
ناونیشان ـ کەرکوك ـ ژمارەی
سنوقی پۆستە(٣٢٨)



ناو ـ نەوزاد حمەسعید
تەمەن ـ ١٨ساڵ
ئارەزوو ـ ژیانی هونەرمەندان
ناونیشان ـ سلێمانی شەقامی
صابونکەران ژمارەی خانو(٥)



ناو ـ سلێمان خانەبرایم
تەمەن ـ ١٦ ساڵ
ئارەزوو ـ وێنە کێشان وشیعر
ناونشان ـ قەزای صدیق ـ
کۆمەڵگای گەلاڵە



ناو ـ جمعە محمود رمضان
تەمەن ـ ١٩ساڵ
ئارەزوو ـ نامەگۆڕینەوەو شیعر
ناونیشان ـ چەمچەماڵ
ئامادەیی پیشەسازی



ناو ـ احمد ابراهیم محمود
تەمەن ـ ١٨ ساڵ
ئارەزوو ـ خوێندنەوەو وەرزش
ناونیشان ـ قەڵادزێ،کۆمەڵگای
پیماڵك



ناو ـ صلاح حمە سعید
تەمەن ـ ١٦ ساڵ
ئارەزوو ـ وەرزشی کۆنغ فو
ناونیشان ـ سلێمانی، گەڕەکی إسکا



ناو ـ لقمان مجید یاسین
تەمەن ١٧ ساڵ
ئارەزوو ـ نامەگۆڕینەوەو شیعر
ناونیشان ـ کەرکوك ـ قلعە ـ
حمام مسلم، ٣٠٦



ناو ـ ئاودێر فقێ عبداللە
تەمەن ـ ١٨ ساڵ
ئارەزوو ـ خوێندنەوەو نامەگۆڕینەوە
ناونیشان ـ چوارقورنە ـ
گەڕەکی شیلانە



ناو ـ محسن صادق جاف
تەمەن ـ ١٨ساڵ
ئارەزوو ـ نامەگۆڕینەوەو مۆسیقا
ناونیشان ـ هەولێر ـ گەڕەکی ئاشتی



ناو ـ سەردار حامد مصطفى
تەمەن ـ ١٩ ساڵ
ئارەزوو ـ نامەگۆڕینەوە
ناونیشان ـ هەولێر، گەڕەکی باداوان
ژمارەی خانوو ٧٢/٦/١٦٥



ناو ـ ولیدرمضان کریم
تەمەن ـ ١٧ ساڵ
ئارەزوو شیعروگۆرینەوەی نامە
ناونیشان دوز ـ گەڕەکی کۆماری ـ٢٤



ناو ـ ڕێبوار توفیق عمر
تەمەن ـ ١٧ساڵ
ئارەزوو ـ خوێندنەوەی شیعر وچیرۆك
ناونیشان ـ سلێمانی، هەواری تازە
٢٤٩/٢٠



ناو ـ ئاوات مصطفى زەنگنە
تەمەن ـ ٢٠ ساڵ
ئارەزو ـ نامە گۆڕینەوەو وێنە
ناونیشان ـ سلێمانی ـ بازاڕی
کوردی



ناو ـ سەرکۆمار جەمال جوامێر
تەمەن ـ ٢٢ساڵ
ئارەزوو ـ نامەگۆڕینەوەو وشیعر
ناونیشان ـ هەولێر ـ سنوقی پۆستە ٥٢



ناو ـ سۆران فوئاد عمر
تەمەن ١٨ ساڵ
ئارەزوو ـ خۆش نووسی
ناونیشان ـ کۆیە ـ قوتابخانەی
پیشەسازی



ناو ـ طارق فائق أحمد
تەمەن ـ ١٨ ساڵ
ئارەزوو ـ شیعر و مۆسیقا
ناونیشان ـ سلێمانی مامۆستایان
ژمارەی خانوو ٢٣٤/٣



ناو ـ وەهبی کاکۆ خالد
تەمەن ـ ١٨ساڵ
ئارەزوو تۆپی پێو نامە گۆڕینەوە
ناونیشان ـ آلتون کوپری حي الشهداء
ژمارە٥٧٥/١/٨١







ناو ـ دلێر توفیق جلال
تەمەن ـ ٢٠ ساڵ
ئارەزوو ـ خوێندنەوەو وێنە کێشان
ناونیشان ـ باڵەکیان ـ قەزای صدیق



ناو: حسین حمە ابراهیم
تەمەن: ١٨ ساڵ
ئارەزوو: وێنەکێشان و نامەگۆڕینەوە
ناونیشان : قەڵادزێ گەڕەکی جوتکانیان



ناو ـ حسن مجید صدیق
تەمەن ـ ١٧ ساڵ
ئارەزوو ـ نامەگۆڕینەوە
ناونیشان ـ هەولێر وێنەگای (بەشدار)



ناو ـ أنور صباح عثمان
تەمەن ـ ١٧ ساڵ
ئارەزوو ـ هونەرو نامەگۆڕینەوە
ناونیشان ـ هەولێر ،حي صدام
ژمارەی خانوو ٦٩٥/٨/٢٥٥



ناو ـ ابراهیم بابکرأحمد
تەمەن ـ ١٨ ساڵ
ئارەزوو ـ نوسینی شیعر ونامەگۆڕینەو
ناونیشان ـ کۆمەڵگای تووەسوران
ژمارەی خانو ١٥١٨



ناو ـ حسین علی محمد
تەمەن ـ ١٧ ساڵ
ئارەزوو ـ وەرزش و نامەگۆڕینەوە
ناونیشان ـ داقوق دێی حەوت تەغار



ناو ـ ناصر حکیم شێروانی
تەمەن ـ ١٧ ساڵ
ئارەزوو ـ خوێندنەوەو شیعر
ناونیشان ـ ناحیەی دیانای قەزای صدیق



ناو ـ عبد الصمد سلطان قادر
تەمەن ـ ١٦ ساڵ
ئارەزوو ـ شانۆگەری
ناونیشان ـ مەخمور ـ ناندوا خانەی مەخمور



ناو ـ ناصح عثمان سوریەشی
تەمەن ـ ٢٣ ساڵ
ئارەزوو ـ خوێندنەوەو نوسینی شیعر
ناونیشان ـ هەولێر ـ ئەسواق حنان
محل ڕێبوار



ناو ـ دلشاد أنور مولود
تەمەن ـ ١٨ ساڵ
ئارەزوو ـ تۆپی پێ و نامە گۆڕینەوە
ناونیشان ـ هاوینە هەواری صلاح الدین ژمارەی خانوو ٧٨٦/٤/٧٩



ناو ـ محمد غنی سعید
تەمەن ـ ١٦ ساڵ
ئارەزوو ـ مۆسیقاو خوێندنەوە
ناونیشان ـ ئامادەیی طاسلوجەی کوران



ناو ـ لقمان صدیق عبداللە
تەمەن ـ ١٧ ساڵ
ئارەزوو ـ شیعر ونامەگۆڕینەوە
ناونیشان ـ سلێمانی ـ گەڕەکی مجیدبگ ٤٩/٧٦/م



ناو ـ نەجات مصطفی روستایی
تەمەن ـ ١٧ ساڵ
ئارەزوو ـ نامەگۆڕینەوەو شانۆ
ناونیشان ـ شەقلاوە، ئامادەیی پیشەسازی



ناو ـ نوزاد رشید عبداللە
تەمەن ـ ١٥ ساڵ
ئارەزوو ـ هونەر
ناونیشان ـ کەلار ـ بازاری گەرمیان پیشانگای دلشاد



ناو ـ محمد مجید پەرخی
تەمەن ـ ٢١ ساڵ
ئارەزوو ـ نامەگۆڕینەوەو وێنەکێشان
ناونیشان ـ قەزای برایەتی ـ گەرەکی غەوارە



ناو ـ حسین رحیم قادر
تەمەن ١٨ ساڵ
ئارەزوو ـ نامە گۆڕینەوەو خوێندنەوە
ناونیشان ـ چەمچەماڵ
دوکانی بازرگانی احمدپیرداود



ناو ـ مشیر خضر زیانك
تەمەن ـ ١٨ ساڵ
ئارەزوو ـ هونەرو خوێندنەوە
ناونیشان کۆمەڵگای بەحرکە ـ هەولێر



ناو ـ بوتان قادر حسین
تەمەن ـ ١٩ ساڵ
ئارەزوو ـ چیرۆك وشانۆ
ناونیشان ـ هەولێر. ئامادەیی دراساتی اسلامیە



ناو ـ نوری احمد خدر
تەمەن ـ ١٨ ساڵ
ئارەزوو ـ خۆش نووسی
ناونیشان ـ کۆمەڵگای تووەسوران رانیە



ناو ـ شاکر مصطفی غریب
تەمەن ١٦ ساڵ
ئارەزوو ـ تۆپی پێ ونامە گۆڕینەوە
ناونیشان ـ قەزاری صدیق گوندی باڵەکیان



ناو ـ محمود کریم محمود
تەمەن ـ ١٧ ساڵ
ئارەزوو ـ خوێندنەوەی گۆڤار و ڕۆژنامە
ناونیشان ـ سلێمانی ـ گەرەکی گوێژە ژمارەی خانو ٤٢/١/٧



ناو ـ بورهان عباس عبداللە
تەمەن ـ ١٧ ساڵ
ئارزەوو ـ نامەگۆڕینەوەو وەرزش
ناونیشان ـ دوز ـ دوکانی نەجم بەرگ دروو



ناو ـ رزگار مەردان أحمد
تەمەن ـ ١٨ ساڵ
ئارەزوو ـ نامەگۆڕینەوە
ناونیشان ـ کەرکوك کتێبخانەی لاوانی شوریجە



ناو ـ شلال محمد باجەلان
تەمەن ـ ٢٠ ساڵ
ئارەزوو ـ پەندی پێشینان
ناونیشان ـ کەلار ـ قوتابخانەی پیشەسازی

# ساباتەکەی خاڵە رەجەب



رەجەب

● دەلێین خاڵەرەجەب کچێکی جوانی هەیە، نازانم کێ بنێرم بۆ خوازبێنی؟
احمد خدر ـ قەڵادزێ

■ دایکت ماوە؟!!

● بۆچی لوتی خاڵەرەجەب لەترۆزێ ئەچێ؟
رەسول احمد اسماعیل ـ شاوەیس

■ خەیار خۆشترە!!

● خاڵە گیان من حەزم لە کچێکە باوکی کەچەڵە چی بکەم باشە؟
علی حسن محمد ـ سەنگەسەر

■ کەچەڵ تیمارکەر بوایە تیماری سەری خۆی ئەکرد!!

● لە ماڵێکدا سێ کچ هەن، یەکێکیانم خۆش ئەوێ، دووانەکەی‌تر رقیان لێمە، چی بکەم باشە؟
فتاح صابر أمین ـ کەلار

■ حەزلەوانیش بکە!!

● خاڵە رەجەب ئایاراستە دەلێن (تۆبەی گورگە مەرگە)؟
سلیم فتاح خورشید ـ دیانە

■ نەء، شەقە!!

● هەموو جارێ کەخەم دام دەگرێ، خێرا سەیری وێنەکەت دەکەم، ئیتر خەمم لەدڵدا نامێنێ!
حەسەن عەبدوڵلا ـ پیمالك

■ پارەکەیم بۆ بنێرە!!

● خاڵە رەجەب، ئەوە بۆ نووکی پێنوسەکەت ئەوەندە تیژە؟
فرسەت أبوبکر ـ خەلیفان

■ چونکە کولە!!.

● ئایا راستە خاڵە رەجەب لەپاسکیل فڕیوەتە سەر دارێك..؟
رێبوار ابراهیم عزیز ـ دەربەندیخان

■ لەپاسکیل نازانم.!!

● من حەزم لەکچێکە(١٨٠)کیلۆمەتر لێمەوە دوورە، چی بکەم باشە؟
احمد ابراهیم محمود ـ قەڵادزێ

■ قوربکە بەسەری خۆتا!!

● خاڵەرەجەب بۆچی قەمسەڵەکەت هەردوو قۆڵی براوە..؟
کمال احمد ـ باریکە

■ چوم بۆ مەزاتخانەکە..؟

● خاڵەگیان من نامەی زۆر بۆ خۆشەویستەکەم ئەنووسم وئەویش وەڵامی کەمم ئەداتەوە! هۆی چی‌یە؟
صدیق صابر ـ دوکان ـ

■ تۆ زۆر بڵێی!!.

● ئەگەر خاڵەرەجەب خۆی لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن بینی ئەڵێ‌چی..؟
محمد حمەشریف ـ رانیە

■ ماشاء الله.. الحسود لایسود!!

● ئایا تاکو ئێستا بەخت لەدەرگای خاڵەرەجەبی داوە؟
خلیل کریم احمد ـ تەکیەی کاکەمند

■ چاوم لێ بوو دای لەدەرگای ماڵی خەسووم.

● بۆچی زۆربەی کچان حەز ئەکەن شوو بە کوڕی تاقانە بکەن؟
جمیل ظاهر ـ کەس نەزان

■ لەترسی خەسوو!!

● کچە تورکمانێك پێی‌وتم «من ساویرم سان»من بڵێم چی‌باشە)
محمد فتاح عزیز ـ سلێمانی

■ من سابوونم سان!!

● ئایا بۆچی کەشەو ئەخەوم چاوەکانم ئەنووقێ؟.
گەنجە گۆمەشین ـ کۆیە

■ چونکە خەوکوێری!!.

● خاڵە رەجەب کچێکم بۆدۆزیوێتەوە، زۆرجوانە، کەی دێی بۆ خوازبێنی.؟
علی حمد عبدالله ـ هەولێر

■ ناوێشانەکەی نازانم!!

● خاڵە رەجەب (خوشکەکەم حەزت لێ ئەکات، ئەڵێی‌چی..؟
طەحمەکاکەرەش ـ چم چمال

■ ئەگەرماڵەوە نەزانێ شتی چاکە!!

● ئەگەر خاوەن ماڵ بەمیوانی وت، کەم بخۆ با قەڵەو نەبیت، مانای چی‌یە؟.
عمر صبری مستەفا ـ پیاز

■ سەخاوەتە....!!

● خاڵە رەجەب ئەڵێن درۆ قۆچی هەیە، ئەبێ راست بێ؟
سەردار مصطفی ـ هەوێلان

■ سەیری سەری خۆتت کردووە؟

# هونەرمەندێك و.. تابلۆیەك

هونەرمەندەكە :

■ ناوی :(تێم ستیل)ە، لەشاری نۆكلاهۆمای وولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لە دایك بووەو سالی ١٩٥٨ چاوی بۆ ژیان هەلهێناوە.

■ لە ئاموزگای هونەریی شاری كانساس میوری خوێندوویەو سالی ١٩٧٩ بەكالوریوسی وەرگرتووەو، سالی ١٩٨٣ ماجستیری لە هونەرە جوانەكان دا لەزانكوی بوستن وەرگرتوە.

■ یەكەمین پیشانگای لە سالی ١٩٨٥دا لە هولی برومفیلدی بوستن دا كردوونەوەو لەپتر لەدە پیشانگای هاوبەش دا بەشداریی كردووە.

■ زور لە تابلوكانی لەلایەن ناودارو موزەخانەكانەوە سەندراوون.

## تابلۆكە

## ئبلیس لەشوێنی كوشتنی سەروك لنكولن دا

● هونەرمەندتێم ئەم تابلویەدا رووداوێكی مێژوویی وێنە دەكێشێت، ئەویش رووداوی كوشتنی سەروكی ئەمریكا. . (ئیبراهام لنكولن)ە، بەلام ناوەروكی تابلوكە دەربرینی ساتی بێ دەستەلاتیی مروڤ دەگەیەنێت، ئەوكاتەی مێشكی هوشیاری مروڤ وون دەبێت و كارێكی نالەبار ئەنجام دەدات. . ئەو كاتەی شەیتان بەسەر بیری مروڤ دا زال دەبێت و تاوانێك یان كارێكی ناپەسەند دەكات. بەلام كە دێتەوە هوشی خوی نەفرەت لەو ساتە دەكات و پەشیمان دەبێتەوە.

لەم تابلویەدا دەردەكەوێت سەروك. لنكولن لەشانودا دانیشتووەو تەماشای شانوگەری دەكات، بەلام لەلای راستی تابلوكەوە پیاوكوژەكە بەدی دەكرێت كە ئەكتەرێكە بە ناوی (جون ویلكز بوث) كەپاش كوشتنی سەروك لەوێوە رای كردە شانوبوی هەلات، دەردەكەوێت بیر دەكاتەوەو دەستی لەپشتەوەیەتی وەك بلێیت ئامێری تاوان كردنەكەی بەدەستەوەیەو لە پشتیەوە شەیتان دیارە لەپەردەیەكی سوورەوە هاتووەتە دەری تاهانی بدات سەروك لنكولن بكوژێت، لەولاشەوە سەروك لنكولن لەسەر كورسیەك دیارەو كلاوقورنەكەی لەسەر زەوییەو لەپشتەوە وێنەكێشراوە مەبەستی هونەرمەند لەمەدا ئەوەیە كە بە ستەم كوژراوەو لەپشتەوە لێی دراوە هیماكانی هونەرمەند ئاشكران: سووری بو خوێن بەكار هێناوە، لە ژێر پێی شەیتانەوە چەند مارێك دەرچوون بەرەو لای لنكولن دەچن ئەمش هیمای بیركردنەوەی شەیتانانەیە كە پالیان بە ئەكتەرەكەوە نا تاوانەكەبكات. رەنگی شەوزیشی بو دەم وچاوی كوژراوەكە بەكاهێناوە تایبێتە رەنگ زەردیومردن لەبەر ئەوەیش هونەرمەندەهیمای بەكار هێناوە تاتابلوكە بە سوریالیزمیانە دادەنرێت.



تابلۆی كوشتنی سەرۆك لنكولن

● مكرم تالەبانی●

ئامادەی كردووە

# چارچیە

ئامادەکردنی ژیان

عیلاجی دەردی دڵ (ناری لە (طاهر بەگ)تەم[illegible]ناکە:
بڵێ ئەمرۆ گوڵەندامێ بەتیرێ جەرگی پەی کردین

## ماوەی بەدەزگیرانی

من کچێکم تەمەن حەڤدە ساڵ و لەپۆلی پێنجەمی ئامادەیی دەخوێنم ماوەیێک کوڕێکم خۆش ویست، تا بۆم دەرکەوت ئەویش منی خۆش دەوێت جا هەستی دڵی خۆم بۆئاشکراکرد. جارێك بەرێکەوت تووشی یەك بووین بەتەواوی هەستی گەرم و سۆزی خۆشەویستیمان بۆیەکتر هەڵرشت و بڕیاری خۆشەویستیمان دا. پاش چەند ڕۆژێك هاتە خوازبێنیم، لەبەرئەوەی کە کوڕێکی باش و بێ عەیب بوو کەسوکارم ڕازی بوون و بە دەزگیران کرام.

بەڵام گیروگرفتەکەمان لەوەوە دەستی پێکرد، کە کەسوکاری لەسەر کاروباری دارایی وسامان لەگەڵ کەسوکاری من تێك چوون و ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر لێیان دەبوو بە ناکۆکی و ناخۆشی تا وای لێهات ئێمەش هەردوولا تێکەڵ بەگێژاوی ئەو ناکۆکی و دەمەتەقێیە بووین و ڕێگەمان بەرەو دوو ڕیانێك چوو. ئیتر وازمان لێك هێنا.

بەڵام پاش ماوەیەك خەڵکی خێرخواز کەوتنە نێوانمانەوەو ئاشت بووینەوەو وەکو جاران دوو دەزگیرانی خۆشەویست. پاش ئەوە هەرکە باسی مارەبڕین وگوێزانەوەم لادەکرد ئەو خۆی لێ دوور دەکردەوەو دەی هێنایەوە سەر قسەیەکی دی. هەتا لام ئاشکرابوو کەکەسوکاری دەیانەوێ وازم لێ بێنێ.

ئێستا ئێوەچ ئامۆژگاری یەکم دەکەن؟ ئایا دوای ئەوە دەزگیرانی یەکەم هەڵوەشاندەوە کۆمەڵ بەچ چاوێك سەیرم دەکات؟ بەڕاستی لەقسە وقسەڵۆکی خەڵك دەترسم.

«فرمێسك»

سلێمانی

## وەڵام

پیاوکە گوێی لە چیرۆکی ئەوخۆشەویستییەی ئێوەبێت واچاوەڕوان دەکات کە هەموو کەندو کۆسپێك لە ڕێی ئێوەدا تەخت دەبێت و پارەو دارایی لەچاو خۆشەویستی یەکی ڕاست و بەتین دا شتێکی بێمایەیە چونکە کە ژن ومێرد دڵیان بەیەکەدا بەرەبەرە دەتوانن هەموو شتێك دەستگیر بکەن.

بەڵام خوشکێ باکەمێك لەگەڵتا بێ پێچ وپەنا قسەبکەم. دەمەوێ بڵێم ڕەنگ بێ هۆیەکی لەوە گەورەتر هەبێت کە وادەکات کەسوکاری بەرامبەر بەتۆو بە کەسوکارت ئەم جۆرە هەڵوەیستە بوەستن، کە یەکەمجار ئەوان بە دەزگیرانی کوڕی خۆیان قەبووڵ کردو کارەکەیان پێ خۆش بوو.

ئەرێ ئایا داخوازییەکانی ماڵی ئێوە ئەوەندە قورس نییەکە ئەوان نەتوانن شانی بدەنە بەر؟ وەکو داواکردنی زێڕی زۆرو کەلوپەلی ناوماڵی نرخ گران و ئەمەو ئەوەو. هیتر کە ئەم جۆرە داخوازیانەش زۆرجار ئەنجامی پلەو پایەو ئاستی چین و کۆمەڵایەتین؟ باشە، ئەی تۆ، کەکچێکی خوێندەواریت دەورت لە ماڵی خۆتان داچی بووە؟ داخوا نەت توانی لە داوا کاری یەکانیان کەم بکەیتەوە تابە پێی باری ژیان وگوزەرانی دەزگیرانەکەت قسەبکەن؟

ئەمە ئەگەر هۆیەکە هۆیەکی دارایی خەرج وپارەبێت!

پرسیاری دووەم، ئایا بۆچی هەڵوەستی دەزگیرانەکەت بەرامبەر بەتۆ گۆڕا؟ دەبزانە بەڕاستی هۆی چییە ژن هێنانەکەی دوادەخات؟ ئەگەر لەئەنجامی هۆیەکی پەسەندو بەجێ وماقوولەو بوو ئەوە قەیناکا، خۆ ئەگەر هەروەکو پێشان خۆی لێ دوور خستیەوەو لەژن هێنان ڕای کرد، واچاکە تۆش هەڵوەستی خۆت دیاری بکەیت و لەقسەی خەڵکیش نەترسێت، چونکە ماوەی بەدەست گیران کردن بۆئەوەیە هەردوولا لەیەکتر تێ بگەن و بزانن ئایا بۆ بڕینی ڕێگەی دووری ژیانیان پێکەوە دەگونجێن یان نا؟

خۆ تۆ خوانەخواستە خراپت نەکردووە شوورەیی بێت بەڵام سەرەڕای ئەوەش هیوادارم پەلەنەکەیت لە بڕیاردان دا.

## گوایا ژنەکەم ڕابردووی هەبوە

تەمەنم بیستوپێنج ساڵی تێپەڕکردوەو لە دایەرەیەکی گرنگ دا کاردەکەم، خوێندنی زانکۆشم تەواو کردووە، کاتێك بڕیارم دا ژن بێنم کچێکی باشی خێزانێکی دیارم هەڵبژاردو لەماوەی چەند مانگێکی کەم دا هەمووشتێکم تەواو کرد، ئەگەرچی دایکیشی نارازی بوو بەڵام تاکە دەنگێك بوو لەناو خێزانەکەداو چی بۆنەکراو هەرچی داواشی کرد هەموویم بەتەواوی بۆجێبەجێ کرد. ئیتر پێکەوە بووین بەدوو هاوسەری ڕێك و پێك و ماڵەکەمان بەخۆشی ڕوناك کردەوە، بەتایبەتی ژنەکەشم کەیبانوویەکی چاك و ژنێکی بێوێنەبوو.

بەڵام بەختیاریم تاسەر نەبوو، گیروگرفت کەوتە نێوانمانەوە، لەو ڕۆژەوە کەخەسووم سەردانی کردین. تا جارێکیان کە بوو بەشەڕمان دەستی کچی خۆی گرت و بردییەوماڵێ وگوتی ئیتر نایدەمەوە، چووم بێ هێنمەوە خەڵك و خوام لەسەرکردن و کەسوکارم نارده لایان هەرنەی دامەوە. ڕۆژێکیان بە خەسووم گوت، باشە بۆچی وادەکات و ڕاستی مەسەلەکە چییە؟ گوتم باچاوم بە ژنەکەی خۆم بکەوێت ولێی تێبگەم! نەی هێشت و دەزانی چ قسەیەکی نەشیاوی کرد؟ کەهەرگیز بڕواناکەم. گوتی: کچەکەی بەر

لەمن حەزی لە گەنجێکی تر کردبوو و ئیتر نەیتوانیوە لەبیرخۆی بەرێتەوە، ئای لەم قسەیە! برواتان بێت تا ئێستاوری کردووم.

لەئێوە دەپرسم ئایا راستە شتی وەها روودەدات، تۆ بڵێی دایکێ بەم جۆرە هەبێت و قسەی وەها بۆکچەکەی هەڵبەستێ؟ هەتا ئەگەر قسەکە راستیش بێت چۆن وا دەڵێ تا ناچار بووم دەستم لێ هەڵگرت، واتا تەڵاقم دا. بەڵام هێشتا هەر خۆشم دەوێ و باوەڕم بەوقسانە نی یە کە دایکی گوتوونی.

ئێستا چی بکەم و چارم چی یە؟ چاوەڕانی وەڵامم.

ج. ر /سلێمانی

## وەڵام

برادەر! واخۆت بەدەمی خۆت دەیڵێی چۆن دایکێك حەزبە بەختیاریی کچەکەی خۆی بکات ئەم جۆرە قسانە دەکات؟

بەتایبەتیش کەشووی بەکێك کردبێت پێی رازی بووەو کورەش چ درێغی لە جێبەجێ کردنی داخوازی یەکانیان دانەکردبێت!

ئەگەر مەبەستی رووخاندنی هێلانە وتێك دانی ماڵی کچەکەی نەبێت چۆن وادەڵی هەتا ئەگەر گریمان راستیش بێت؟

خۆت کە ژنت هێنا هەستت بە بەختیاری کردو لەگەڵ یەکتردا گونجاو بوون، خۆ رۆژێك هەست بەنابەدڵی و ناحەزیی ژنەکەت نەکرد کەلێی دیارکەوێت لەگەڵتا ساردە.. چونکە ئەم مەسەلانە لە ناخی ئینسانەوە سەر هەڵ ئەدەن و تێکەڵ بەهەڵسوکەوتی رۆژانەی دەبن هەرچەند هەوڵ بدا خۆی بە جۆرێکی تر دیاربخات بەڵام لێی هەر بەدەر دەکەوێت.

جگە لەوە خۆت دەڵێی کەژنێکی باش بووەو هیچ گلەیی یەکت لێی نەبووە پێش ئەوەی دایکی بێتەلاتان.

من سەرم لەهەڵوەستی تۆ سوڕماوە، چۆن نەت کرد هەرچۆنێك بێت ژنەی خۆت ببینی و قسەی لەگەڵ بکەیت تالێك تێ بگەن؟ تاراستی مەسەلەکە بزانیت؟

ئێ چۆن تەڵاقت دابەر لە لەوەی لەهەموو رویکەوە دڵنیا بیت؟ ئێستا خۆشەویستی و وەفاداری ودڵسۆزیی تۆبەکەڵکی چی دێن؟

من لام وایە بەپێچەوانە، تۆ بەڵگەی ئەوەت پیشانی ژنەکەت دا کە گورج بەپێی ئارەزووی دایکی دەستت لێ هەڵگرت و یەکسەر باوەڕت بە قسەی دایکی کرد.

جا ئێستا دوای ئەوەی بریارێکە داوتەو پرس و رای ژنەکەشت وەرنەگرتوە فرمێسکی پەشیمانی بۆکێ؟

## لەرەفتاری ژنەکەم تێناگەم

برای بەرێزمان ع. ع عارف لەسلێمانی یەوە لەنامەکەی دا دەڵێ:

پاش دووساڵ خۆشەویستی خوازبێنیم کردو بەچەند مانگێکی کەم پێویستیی رەماوەندمان تەواوکرد وبەوپەڕی خۆشەویستی یەوە ئەرکی هاوسەریمان جێبەجێ کرد.

لەماوەی هەشت ساڵیش دا خوا دوو منداڵی پێ داین.. منیش چی لەتوانام دابوو بۆ بەختیاریی ماڵ ومنداڵ درێغیم نەکرد، بەڵام نەمزانی چۆن لە ناکاوێکا رەشەبایەکی ناوخت هەڵی کرد؟

ئەگەر راست دەوێ ئەوە سێ ساڵە هەست دەکەم رەفتاری ژنەکەم بەرامبەربەمن و بەماڵە کەم گۆڕاوە.

سەرەتا، چاوی خۆم لێ نووقاندو وتم رەنگە بێ ئەمە حاڵەتێکی کرژیی دەروون بێ خۆی چاك دەبێت، بەڵام هەر چاك نەبوو هەتا روو بەروو چی لەدڵم دابو پێم گوت و گوتم:

ئاخر بۆچی وادەکات و چی نیازە؟

بەڵام هۆی راستەقینەی پێ نەگوتم، پاشان داوام لەکەسوکاری کرد بزانن هۆی گۆڕانی چی یە، ئەوانیش هەوڵەکەیان هەر بێ سوود بوو.

ئەوەش بزانە، من معاشەکەم هەموو لەچنگە ژنەکەم دەکردو هەرچی یەك لەبازاڕ بەرچاوم بکەوتایە بۆم دەکڕی و پێشکەشیم دەکرد، لە خۆشەویستیش دا کەمتەر خەمیم نەکردووە! بەڵام ئەمانەی هیچ بەدڵ نی یە. تاوام لێ هاتووە بڵێم لەم ژینە بێزارم و چی دیکە ناتوانم وەهاگوزەران بکەم. ئێستاش داماوم.. چی لەگەڵ بکەم؟

ع. ع عارف.. سلێمانی

## وەڵام

براگیان، رێی تێناچێ بەبێ هۆیەکی ماقوول ژنەوا بەم جۆرە هەڵسوکەوتی ساردوسر بێت و خۆی لاتەریك بکات و لەناکاوێك دا هەستو سۆزی بگۆڕێت؟

دوورنی یە رەگی گۆڕانە قووڵ داچووبێت، بەجۆرێك بەماوەی سێ ساڵ ئەتۆو نەکەسوکاری ئەتان زانی چی یە؟

کەوابێت پێش هەموو شتێك تۆش رەفتارت بگۆڕە.. دەدووری مەزانە ئەم ژنە لەو جۆرە ژنەبێت کە حەز بەپیاوێکی بەهێزی خاوەن ئەمروفەرمان بکات وپیاوێکی گەرەك بێت کەلەماڵ دا کەس لەقسەی دەرنەچێت.

ئەگەر ئەمە نەبێت کێ دەڵێ هۆیەکە بارەو دارایی نی یە؟

لەوانەیە بەتەمای ژینێکی ئاست بەرز بووبێت کە سەیری کردووە ئەم ئاواتەی نەهاتوەتەدی تووشی وەڕسی وبێزاری هاتبێت.

بەڵام ئەم شیکردنەوەو بۆچوونانەش هیچ کامێکی رێ بەژنی رووسووری ژێر نادەن بەجۆرێك رەفتار بکات کە بەختیاریی ماڵ و مێردی لە بیر بکات. ژن و پیاو دەبێ هەردووکیان بەدرێژایی تەمەنیان بۆ بەختیاریی خێزان تەقەلابکەن و لە خۆبەخت کردن درێغی نەکەن.

کاکی برا، بەبێ ئەم لاو ئەولاکردن، ئەو هۆیانەی پێ بڵێ کە بوونەتە مایەی گۆڕانی هەتا ئەگەر شتێکی درکاند.. هەوڵ بدەن پێکەوە چارەی بکەن. ئەگەر هەر پێی لە هیچ نەنا.. تۆش ماوەیەك لێی بێ خەم بەو گوێی پێ مەدە بەڵکو گوێ پێ نەدان و بەخەمەوە نەبوونی تۆ بەهۆش خۆی بێنێتەوە بەڵام تکایە لەبەر چاوی دوو منداڵەکەت وبە ختیاریان دان بەخۆت دا بگرەو تا دەتوانی پشوو درێژبە.

## کورتە وەڵام

بۆ خاتوو ژیان محمود لەهەولێر:

ئەم گیروگرفتەی تۆ گیروگرفتی زۆربەی کچانی ناوچەکانی تری عیراقی ئازیزمانە بەڵام بەقسەی خۆش و هەڵوەستی نەرمونیان دەتوانیت لە باوکت بگەیەنیت کەزۆر نەریت و داب ودەستووری کۆن بۆ زەمانی ئەمڕۆ دەست نادەن. کەی زەمان، ئەوە ماوە کچ بەمنداڵی مارەبڕ بکرێت؟

خوا یار بێت لەژمارەیەك لەم گۆڤارەدا کەمێك درێژتر لەسەر ئەم باسە کۆمەڵایە تی یە دەنووسم.

بەڵام خوشکێ! تکات لێ دەکەم لە بڕیاردانی ئاکەکەس دا پەلە نەکەیت نەوەکو ئەنجامەکەی بە پێچەوانەی مرازی تۆبێت پرس بەکەسانی لەخۆت گەورەتر و دنیادیدەتر بکەولە پەنای خوادابێت.

ئەم ڕۆژانەدا دەزگاپزیشکی یەکانی ڕۆژاوا. خۆیان داوەتە چارەسازیی زۆر نەخۆشیی دەروونی و لەش بەهۆی خاوبوونەوەوە جۆری چارەکردنیش نیجگار ئاسانە. کە بریتی یە لەوە نەخۆشەکە لەسەر پشت رادەکشی و چارەکەر دەنگی مۆسیقایەکی نەرمونیانی لە شێوە زرنگەی زەنگوڵەی وەبەر گوێ هەڵ دەدا بەهۆیەوە نەخۆشەکە هەست بە خاوبوونەوەیەکی تەواو دەکات. ئەم حاڵەتەش بەکاکڵی ماتە وزەکانی خۆی خۆی دەگەیەنی وبەهۆیەوە وزە بە دەرەوەکانی نوێ دەبنەوە دوای ئەوەی کەڵەکەڵ ماتە ووزە بێ سنوورەکانی لە قووڵایی دەروون ڕۆچوودا تێکەڵ دەبن. پاش ئەمە. ئیتر نەخۆشەکە دەتوانی بەرەبەرە زیاتر لە بەردنی ئاڵۆزیە دەروونی و گیروگرفتە سەختەکانی لەشی خۆی تێبگات، بە مێشکێکی ساف و زەینێکی گەشاوەوە.

بەنموونە. ئەگەر نەخۆشەکە دەردە دڵی هەبوو. ئەوسا بەهۆی ئەم ڕێگەیەوە دەتوانی بزانێت چ هەڵچوونێکی ویژدانی بووەتە مایەی ئەم حاڵەتەی. ئایا دڵەڕاوکێ یە. یان ترسە. یان هەستی دڵنیا نەبوون و ڕژدییە کەوا ئەم هریانەی نەخۆشی زەبریان کەڵەکە دەبێت و بەرەو بانی لەش هەڵ دەکشێن. ئەمەش چونکە نەخۆشەکە بەیارمەتی دەنگی تایبەتی موسیقای چارەسازییەکەوە بە زەینێکی گەش و بیرێکی تیژ لەخۆیەوە دەگاتە دەرك پێ کردنیان.





## شیر بۆ بەژن ڕێکیی تاسەر

شارەزایـانی خۆراك و تەنـدوستی وەرزش و کاروبـاری جوانـیی ژن دووپـاتی دەکەنەوە کە شیر چاکترین خۆراکە کە بۆ لەش بەسوودەو هەمو ڤیتامینە پێویستەکانی لەشی تێدایە. بۆیـە بە ژەمێکی بنـەرەتی تەواو دادەنـرێت بۆ ئەوانـەی لەخـواردن ڕژیم دەکـەن و کێشی خۆیـان کەم دەکەنەوە.

پسپـۆڕان دەڵین، پەرداخـە شیرێك ئەوەنـدە تاوزەی گەرمیی تێدایـە کەلـە (٦٠)تـاوزە لەهـەر ١٢. غرام دازیـاتـر بێـت، بەم پێـیـە هەرژنێـك دەتـوانێ لەباتی خواردنی سەمـوونێـك دوو پەرداخ شیـر بخـواتەوەو هەمـان تاوزەی گەرمی دەست دەکەوێت.

نەك هەر ئەمـەنـدە، شیـر بۆ پێست زۆر بەکـەڵکە، کەوا گەش و نەرم و بەپـرشـەی دەکـات، بە تایبەتی لەو کاتـەدا کە پارێـزو ڕژیم دەگیـرێت لەبـەر کەم خۆراکی پێست وشـك هەڵ دەگـەرێت. دوا ئامـۆژگـاریی شارەزایـان ئەوەیـە دەبـێ دوای خواردنـەوەی هەر پەرداخـەشیرێك ئاوێکی زۆر بخـوڕێتـەوە تا مرۆ تووشی وگیری نەبێت!

## بانگەوازێك بۆ [illegible]



بەبێ چالە جل و بەرگ و ج لە مۆدەو توالێـت کاری و پرچ ڕێکخستن دا. چـونکـە جوانی ئافرەت بەهێمنی و ساکاری و بێ لی هەڵەبڕین دەردەکەوێت.

• کۆمـەڵـەی ژنـانی بەریتـانیـا،لـەم دوایی‌یەدا دەستی داوەتە هەڵمەتێکی تونـدو تیـژ بۆسـەر مۆدەی بێ مـانـاو دیمـەنی سـەیـر و بەرەڵـلای کچـانی هەرزەکـار کە بەجـۆرێکی سـەیـر قژیـان کرژو لوول دەکـەن یان پرچیـان بەشێوەیەك دادەهێنن هەر لە غوولی بیابان درندەی جەنگەڵستانی ئەمەزون دەکەن.

کۆمـەڵـەکـە کە ئەمـەی گوتـووە، ئەوەشـی دووپـات کردۆتـەوە کەهـەمیشـە لایەنگری سـەربەستیی ئافـرەتـەو پێـویستـە هاوتـای پیاو بن بەڵام بەم تەرزە مۆدەو نەخـشـە کرێتـانـە دروشمی دەمـوچـاوی سروشتکـردی خۆیـان دەشێوێنن ئەوکچانەی وادەکەن دیارە ساوێلکە وکـەم هۆشـن و بەتـەواویـی لە مانـاومـەبـەستی

کۆت و زنجیرلابردن نەگەیشتوون

کۆمـەڵـەکـە ئامـۆژگـاریی کچانی هەرزەکاری کردووە کەدەبێ ژیری و مەنتیق بەکـاربهێنن بەر لەوەی دەست بۆ ئەم جۆرە تازە خوازی‌یە ...

# بۆچی مێینە تەمەن درێژترە

ئەو لێکۆڵینەوانەی پەیتاپەیتا گۆڤاری، پزیشکایەتی سویدی، بڵاویان دەکاتەوە لەسەر ئەوە سوورن کە ئافرەتان لەپیاوان تەمەن درێژترن.

جارێ لە قۆناغی زگ پڕیدا واباوە منداڵدانی ژن (١٣ ـ ١٥)نێر هەڵ بگرێت بەرامبەربە (١٠)مێ. حاڵەتی لەبارچوون و بەرهاوێتەیش ئەگەر کۆرپەلە نێربێ زۆرتر ڕوودەداوەك کە منداڵەکەمێ بێت، خۆ ڕادەی مردنی ساوایانیش لە ناو کوڕان دالە کچان زیاترە! ئەمەش سەبارەت بە جۆری جینی هەردووتوخمەکەوهۆرمۆنەکانە بەتایبەتی هی ژن، هەروەها ئەوتایبەتی یەی کەمێشکی هەر یەکەیان هەیەتی لەچۆنیەتی قەبووڵ کردنی تووش بوون بەنەخۆشیو دەردو دوو..

هەندێ لێکۆڵینەوە دەڵێن (٦٠٪)ی فەرقی تەمەنی نێوان پیاووژن دەگەرێتەوە بۆ دەردو بەڵای کۆمەڵایەتی یەکان کەتووشی پیاودەبن. ئەوەکەشی تریش واتا (٤٠٪)ەکە لە سروشتی پێکهاتووی بایۆلۆجیی توخمەکە خۆیدایە. جائەگەر ژن زیاتر ئامادەیی تووش بوونی بە نەخۆشی هەیە، ئەوا پیاو زۆرتر تووشی نەخۆشی یە مرۆکوژەکانی وەکو شیرپەنجەو دەردەدڵ دەبێت.

کورتەی قسە ئەوەیە کەپیاو لەژن زیاتر تووشی مەترسی یەکانی مردن دەبێت ئەمەش لەهەموو قۆناغەکانی تەمەن دا.

# منداڵانیش مۆدەی قژ ڕێکخستنی خۆیان هەیە





خاتوونەکە! تۆ دەزانی منداڵەکانت چ کوڕ چ کچ پێویستیان بەوە هەیە جوان و ڕێکوپێک بن ولەپێش چاوی خەڵك دا بەدیمەنێکی شیاو دیاربن. کەوابێت باچەند مۆدێلێکی تازەی قژداهێنانت پیشان بدەین کە وەستایانی قژرێك خستن ئامادەیان کردووەو بزانە کامیان بەدڵی منداڵەکانتە؟ ئەوەش بزانە کەپێویست بەگیرەو تۆقەو شتی وەها ناکەن و دەتوانیت بەشیواریان بەپەنجە ڕێکیان بخەیت.







## ئایا راستە؟

قارەمانی یاری خلیسکانی سەرئاو خانمی (لیبر هوپس) دووپاتی کردوەتەوە کە ژنانیش خاوەن لێش وکەمار کارامەو لێهاتوون و لە پیاوانی خاوەن لێش وکار چالاکترن.

هەروەها لە پیاویش خێراتر کار رادەپەڕێنن و زیاتریش لەگەڵ یەکتری دا وە لەگەڵ پیاوانیش دا • پێشبڕکێ دەکەن، نموونەشی بەوە هێناوەتەوە کە لە ساڵی (١٩٨٣)ەوە تا ئەم ساڵ ژمارەی ئەو ئافرەتانەی لە پایەی کارڕاپەڕاندن دا کاردەکەن سێ چەندانە زیادی کردووە.

بەڵکو لە کارێ دا لە پیاوان ئازاتر و بەپشوو و بەهێمنتر و چالاکترن.



## کفتەی سەوزە

### کەرەستەکان

- ١/٤ ١ کیلۆ گۆشتا
- ٢ کولیرە(نان)
- ١ هێلکە
- یەك پەرداخ ئاو
- سێ دانەسیر
- زەیت
- یەك سەرەك پیاز
- ٢ دانە بیبەری سەوز
- ١ دانە بیبەری سوور
- کەمێك معدنوس
- ٢ کەوچکی گەورە دۆشاوی تەماتە
- ٤ دانە تەماتە
- خوێ. بیبەر بهارات

### چۆنیەتی دروست کردنی

● پاش ئەوەی گۆشتەکە ورد دەکرێت لەگەڵ نانەکەدا تێکەڵاو دەکرێت، کە لە سەرەتادا نانەکە پاش خوساندنی لە ناو ئاو بۆ ماوەیەکی کەم لەگەڵ گۆشتەکە تێکەڵاو دەکرێت، ئەوەجا سیرە کووتراوەکە دەکەیتە سەری لەگەڵ هێلکەکەو معدنۆسە کووتراوەکەو خوێو بیبەرو بهاراتەکان ئەمانە هەموو تێکرا تێکەڵاو دەکەیت.

● ئەوەجا پاش تێکەڵاوکردنی نەختێك دی شێلیت تا وەکو هەویر یەك دەگریت، پاشان بە ئارەزووی خۆت دەتوانیت دروستی بکەیت بە شێوەی گونگ یان چوار گۆشە.. هتد

● ئەوەجا لەناو رۆنە زەیتەکە جوان سووری بکەرەوە

● ئەوەجا لە سەر کاغەزی تەنک دایبنێ بۆ ئەوەی رۆنەکە بمژێت.

● بیبەرە سەوزو سوورەکە لەسەر ئاگر ببرژێنە ئەوەجا لەت لەتی بکە.

● پیازەکە جوان بجنەو هەر چەند دەتوانیت زۆر ووردی مەکە، ئەوەجا لەناو رۆنە زەیتەکە سووری بکەرەوەو لەگەڵ هەندێك لە مەعدنۆسەکەو بیبەرە برژاوەکە لەگەڵ چەندلەتە تەماتەی قاش کراوەدا بە جوانیو رێك و پێك بخەرە سەری.

● ئەوەجا بیخەرە سەر ئاگر بۆ چەند دەقەیەك با لە سەر ئاگرەکەدا بێت و کە دڵنیا بوویت لە کوڵاوی سەوزەکە دوو پەرداخ گۆشت یا مریشکی وورد کراو بخەرە سەری لەگەڵ یەك پەرداخ ئاوو هەندێك دۆشاوی تەماتە.

● ئەوەجا بیخەرە سەر ئاگرێکی مام ناوەندیو بۆ ماوەی چارەکە سەعاتێك بالە سەر خۆ بکوڵێت.

● ئەوەجا لە کۆتاییدا کفتە سوور کراوەکە بخەرە سەری لە سەر ئاگر دایبنەو بۆ ماوەی بیست دەقیقە تا بکوڵێتن و بە گەرمی پێشکەشی بکە..

● زینب حسین ●

## چاوپێکەوتنێک لە گەڵ هونەرمەند

# سەردار ئەحمەد



هونەرمەند سەردار بەنای



بێ دەنگی: ئەم ووشـە یە لە شوێنی خومی وەستـانم گە لەسـەر دەرگـای هوڵەکە نوسرابوو، نەم ئەزانی چوّن بچمـە ژورەوە، لە دلێ خوما ووتم بوّ نەچـم بوّ ژورەوە! کە دەرگـای هوڵـەکەم کردەوە زانیم کە خەریکی تومـار کردنی چەنـد گوّرانیـەکی نوێیـە جائێـستـاش من ئەمـەوێ ئەم هونـەرمـەندە بە خوینەرانی گوٚڤاری (رەنگـین) بنـاسـێنم وچـەنـد پرسیارێکی ئاراستە بکەم بوّیـە ئەوپرسیـارانـەی لەگەڵ خوّم هەلگرتبوو ئاراستەم کردوو پێم ووت

جا بالـەهیـچـەوە دەست پێ بکەین؟

- فە رموو ئارەزووی خوّتە!

● ئەمـانـەوێ پێش هەمـوو شتێـك خوت بە خوینـە رانی گوٚڤاری (رەنگین ) ی ئازیز بناسێنی؟

- ناوم (سـەردار ئەحمەد عەبدولایە) لە سالێ ١٩٤٥ لەشـاری کوّیـە لە دایـك بویم ودەرچـوی پەیمـانگای هونـەرە جوانـەکـانی بەغـدام بەشی موسێقاو ئامیری فلوت.

● کەی دەستت بەموسێقا کردووە؟

- لە پولـی چوارو پینجی سەرە تایی بووم دەسـتـم کرد بە (دووزەلـە لێـدان) و(نـای) کە لەدار دروست کرابـوو، هوێـە کەشی ئەوەبـوو کە ئارەزووم کەوتـە سەر دووزە لەونای کە ئەوکـاتـە باوکم لەگـەراج کاری دەگـرد پاس هەبـوو هاتـوو چوێ نێوان هەولێرو کوێەی دەکرد یەکێك لە شوفێـرەکـان کە ناوی(عـەبدوٚك) بوو دووزەلـەی لی‌ذەدا لەگـەڵ نای دار منیش زوٚر ئارەزووم کەوتەسەر

● بـاسی ئاوازی موٚسیقـامـان بوّبکـە کە ئەوکـاتـەی لەسەرە تای فێربونت بویت؟

- ئەوی راستی بێ ناتوانم ئەوهەستە دەربرم بەرامبەر بە ئاوازی موٚسیقای ئەوکـاتە! چونکە من گوێم لەموٚسیقا دەگـرت تەنیا کەموٚسیقایە بوّیە گوێم لە هەموو ئاوازو موٚسیقایەك دەگرت بە تایبـەتی کە لە رادیـو دەنـگـی (شمشـاڵ)م گوێ لێ ئەبوو.

● کێ کارێ لێ کردووی وەوای لێ کردی ببی‌یـە هونـەر مەند؟

- وەك ووتم لەسەرە تادا(عەبدوك)ی شوفێـر یەکـەم کەس بوو کەوای لێ کردم ئارەزووم بکـەوێـتـە سەر موٚسیقا، لەدوایی‌دا ماموٚستا (محمد أمین معـروف)کـە ماموٚستای زمانی عەرەبی بوو زوٚر هانی دەدام کەوازلە موٚسـیـقـا نەهـێـنـم. بەلاّم مامـوٚستـا(بـاکـوری) دەورێکی سەرەکی هەبوو کە بگەمە ئەوپایەی کە ببم بە هونـەرمـەند،

● لەچ شوێـنـێـك وانـەی موٚسیقـات وەرگرتووە لە یەکەم جاردا؟ وەکەی!؟

- لە سالاّنـی ١٩٦٢ - ١٩٦٣ بویـەکـەم جار وانـەی موٚسیقـام لەپـەیمـانگـای هونـەرە جوانـەکانی بەغدا وەرگرتووە

● یەکـە ئاوازت چی بووە کەدات ناوە لەژیانی هونەریت؟

- یەکـەم ئاوازم بەنـاوو نیشـانی(زوٚزان) بوو کە لەگەڵ تیپی موٚسـیـقـای باواجـی بوٚتـەلـە فزیونی(تەئمیم)م تومارم کرد

● یەکـەم ئاهـەنگ کە سازتان کرد لەکوێ بوو؟ کەی؟!

- یەکـەم ئاهـەنـگ کە سازمـان کرد لەسـالی ١٩٦٧ بوو لە قوتـابخانەی دوانـاوەندی کوێەی کوران کە ئێستا قوتـابخـانـەی ئاسوسی سەرەتای‌یەو ئەم هونەرمەندانە .بەشداریان کردبوو: -

- ماموّستا (باکوری)بەعود

- هونەرمەند (نشأة حمید)بەدەف.

- هونەرمەند (عونی علی)بەتەیل.

- هونەرمەند(سەدار ئەحمەد)بەنای.

● کەی چون بوّ تەلە فزیوّن؟

- بوێـەکـەم جار لەگـەڵ تیـپـی



خیزان وعنالانی هونەرمەند سەردار ئەحمەد

جمهوری کە لەبەغدا ئەم خوێند لەگەڵ برادەران فاروق هلال، داود القیسی محمود محمد، انورصالح چووم بۆ تەلەفزیون.

لەساڵی ١٩٧٢ لەگەڵ تیپی مۆسیقای باواجی چەند گۆرانیەکمان تۆمارکرد بۆتەلەفزیونی بەغدا لە دوایی دا لەگەڵ تیپی هونەری هەولێر چووم بۆتەلەفزیون.

● **ئیمە لەکوێین لەگەڵ مۆسیقای ڕۆژئاوایی؟**

- ئیستا ئیمەی کورد گەیشتوینەتە پلەیەکی باش لەهونەری مۆسیقا لەبەرئەوەی هونەرمەندو کادیری باشمان هەیە کە توانیویانە شوێنی خۆیان بکەنەوەو بتوانن هونەری کوردی بەگشت جیهان بناسێنن.

● **هونەرمەندان (وریا ئەحمەد)، (ئەنوەرقەرەداغی)، (دلشاد محمد سعید)مۆسیقا ژەنی باشن تۆ وەك هونەر مەندێك چی ئەڵێی دەربارەی ئەم سێ هونەرمەندە؟**

- ئەم سێ هونەرمەندە شوێنی خۆیان کردوەتەوە لەناو دڵی جەماوەری کورد بەگوێرەی ئەو خزمەت و کارکردنەی کەپێشکەشی بە جەماوەری ئەکەن خۆزگە هاوتایان زۆردەبوو چونکە ئەم سێ هونەرمەندە قوتابخانەیەکن وتوانیویانە بەتەواوی خزمەتی هونەری کوردی بکەن.

لەدوایی دا ڕوومان کردە لای دایکی زۆزان و ئەو پرسیارەمان ئاراستەکرد.

● **بایەزانین دایکی زۆزان تۆچی، ئەڵێیت بەرامبەر بە کاك سەردار کە تۆ هاوسەری کاك سەرداری ونزیك ترین کەسی لەلای؟**

- ئەوی ڕاستی بێت من زۆر خۆشحاڵم بەو کارەی کەختویەتیە ئەستۆی خۆی کە ئەویش خزمەت کردنی هونەرو مۆسیقای کوردیە بۆیە هەردەم هانم داوە کە بەردەوام بێت لەوکارەی. جگە لەوەش من مناڵە کانیشم هانداوە بۆنەوەی کە لە هونەر نزیك بنەوە بەتایەتی هونەری مۆسیقا ئەوەتا کچە گەورەکەم کە پۆلی چواری ئامادەیی یە جگەلەوەی کەلە تیپی مۆسیقای باواجی کۆرسە ئێستاش خەریکی فێربونی ئامێری قانونە لە مەڵبەندی لاوانی کۆیە ڕاهێنان دەکات(بروا)ش کەلە پۆلی چوارەمی سەرەتایی یە ئەندامی تیپی مەڵبەندی لاوانی کۆیە یەو بەتەپڵ بەشداریان لەگەڵ ئەکات جا ڕوومان کردەوە لای کاك سەردار

● **ئەوکە سانەی کەوانەی مۆسیقات پێ داون؟**

- لەژیانی هونەریم دا وانەی مۆسیقام بەزۆر کەس داوە لەمانە هونەرمەند(وریاەحمەد)کە توانیم چەندوانەیەکی پێ بدەم وفێرە (نۆتەی)مۆسیقای بکەم. هەروەها ئەم هونەرمەندانەش وانەی مۆسیقایان لەمن وەرگرتووە پێش ئەوەی بچن بۆیەیمانگای هونەرە جوانەکان! لەموسڵ ١ - سرتیپ احمد ٢ - چاپوت محمد ٣ - سفین عبدالرزاق ٤ - مظهر اسماعیل

● **تاکو ئێستا چ خولێکی فێربونی مۆسیقات کردوتەوە وەلەکوێ؟**

- لەساڵی ١٩٨٦ خولێکی مۆسیقام کردەوەو لە مەڵبەندی لاوانی کۆیە کە توانیمان بە(٩)مانگ بەشداری لە فیستڤالی لاوان بکەین لەهەولێر وپلەی یەکەم بەدەست بێنین.

هەروەها لەساڵی ١٩٨٨ خولێکی ترم کردەوە هەر لەهەمان شوێن.

● **دوابەرهەمی موسیقاو گۆرانیتان چی بوو؟**

- دوابەرهەمی هونەریمان ئەوەبوو کە ١٢/١١/١٩٨٨ شەش گۆرانیو پارچە موسیقایەکمان بۆتەلە فەزیونی تەئمیم تومارکرد لەگەڵ تیپی موسیقای باواجی کۆیە

● **دوای ووتەت چی یە؟**

- زۆر سوپاسی کاربەدەستانی گۆڤاری ڕەنگین ئەکەم کە ئەم دەرفەتەیان دام کەبتواخم خۆم بەجەماوەری کوردبناسێنم هیوای سەرکەوتنیان بۆدەخوازم

هەرسەرفرازین

سوپاس

**●هۆشیارعبدالرحمن محمد●**

**وێنەگرتنی**

**سامان طاهرمعروف**

## مەتـــــەڵ
## ژمـــــارە(١٦)

شاعیرێکە ناوی گەشە
دوو برگەیەو بە پێت شەشە

برگەی یەکەم (یٚ)ی پیاکە
وشەیەکە دەڵێ: ڕاکە

برگەی دووەم پووری ناوە
زار زمانێکی ناسراوە

کە وەرگەڕا ، دانەمێنی
مژەو زستانان دەیبینی

برگەی یەکەم لەگەڵ (بەست)دا
وشەو سۆزە لەگەڵ هەست دا

کارو پیشەی «شاعیرمانە»
لای ئەو وردو سادەو جوانە

ئەگەر پیتی سێ و چواری
جێ بگۆڕن بە هاوکاری

دەبێتە شازادەی خەمگین
کەمام شەکسپیر پێی ناسیین.

● ع. بێمار ●

## سەرەنجامی گرەوی
## مەتەڵەکەی ژمارە |١٥|

یەکەم ـ شوان ندیم معروف ـ چم چمال / گەرەکی بێ کەس
دووەم ـ صالح حمەأمین قادر ـ کەلار / کۆمەڵگای صمود
سێیەم ـ دژوار أنور محمد أمین سلێمانی / گەرەکی کارێزەوشك

**گرەوەکەش مەولەوی یە**





لە نێوان ئەم دوو وێنەیەدا (١٠) جیاوازی هەیە ئایا ئەتوانی لە ماوەی ٣ دەقیقەدا دەس نیشانی کەی؟

ناو ـــــــ
ناونیشان ـــــــ
وەڵام ـــــــ



سەرداری ئەم سەگە کوانێ

٢ ، ٤ ، ٦ ، ٨ ، ١٠
١٢ ، ١٤ ، ١٦ ، ١٨

| | | |
|---|---|---|
| ٤ | ٨ | ١٨ |
| ١٤ | ٦ | ١٠ |
| ١٢ | ١٦ | ٢ |

ئەم ژمارانە دابنێ لەم چوار گۆشانەدا بەمەرجێ کۆبونەوەیان لە هەموو لایەکەوە بکاتە (٣٠)

## وشەی یەکتر بڕ



زاویتـه، کانـی ماسـێ، وانێ،
دیاربەکر، دهوك - رویبار - چنار-
کاژ- کاره - سرسنـك - جزیرێ -
خانێ نالبەند- ژن ئەلند، پرگرین

پشتی نوڤان پەیڤا ژێ بەێ دێ بوته
ناڤـەکێ کوردی دیاربیت گرێدانەکا
هەی ب دیروکا کوردائه.
چیـا، مەتـین ، خابیـر ، زێ،

## ڕێ ونبوون



## شیکاری ژمارە ١٥





ئەگەر ٦ دانە شقارتە لەم شێوەیە هەڵ بگـــــری ئەوا ٣ چوار گۆشـەیت بۆ پێـك دێ کاتێکی خۆش



ئایـا ئەتـوانی بە پێنوس بە سەر ئەم شێوەیـەدا تێپەڕ بی بەبێ ئەوەی پێنو سەکـەت هەڵگـری و بەسـەر هەمان خاڵـدا دووجـار تێـپـەڕی


محمد سالح
کاریکاتێر


هەی بەلارو بەلارو بەلارەوە
دیاریم بۆهێناوی لەکەلارەوە !!
معجون طماطة


بەرامبەرم پڕاوە بووە
گزەی جەرگم وەک تەنووره !
مووچەخۆر


ئا.ئا.ئاخ ... ئۆۆۆۆف
ئای ی ی ی ی ی ....



* **خاڵە گیان بەڕای جەنابتان** کەی ئافرەت **قینی لە خشڵ و زێڕ دەبێتەوە؟**

پەیمان قادر

سلێمانی

- **کاتێ لای ئافرەتی** تر دەیبینێ..!!

- خاڵە ڕەجەب ئاخۆ لەکاتی باراندا بەچی **ئیزعاج دەبی..؟!**

**عمر حمه امین**

- **بە قورو** چڵپاوی ڕێگاو بان..!!

* کاتێك کە خاڵە گوێی لە گۆرانی خوالێخۆش بوو علی مەردان ئەبێت، چی دەڵێت؟

سەردار حامید

کەرکووك

- دەستی شکاوم.. نان بۆ نانەواو گۆشت بۆ قەساب..!

* ئاشێ خاڵە نەزانێ مودیلی تازەی ساڵی نوێ بەلای ئافرەتەوە چییە..!!

سۆزان عزیز

سلێمانی

- خا... خا...ریجە.. خاریج..!!

* خاڵە گیان ئەوە ئەو سەبیلەت کەی تەواو ئەبێ..؟!

محمد صدسق رواندوزی

ڕەواندز

- کە پاپیەکەی پەپای تەواو **بێ..!!**

* خاڵە گیان بۆچی کور بەئاسانی دەکەوێتە **داوەوە؟**

**شمیران شاسوار**

**هەولێر**

- چونکە .. (**ناقص و العقل))و حەوصەلەی** پچووکە!!

*خاڵە .. **دەڵێن عەیب نەبێ زۆر** درێژدادری **..... ڕاستە؟**

**جهانگیر محمد سلیم**

**مووصل**

**- ئەڵبەتە جیهانگیر. دەبێ درێژدادرێکی** بەرانبەربێ..!!

*خاڵەرەجەب ئاخۆ ناخۆشترین شت لەژیانتا چییە؟

خێرخواز علی

سلێمانی

- ئەو کاتەیە کەمووچەی سەری مانگ وەردەگرم..!!

# ئامادە کردنی مى محمد

### گاور

هەتا دەتوانی یارمەتی خێزانەکەت بدە دڵیان مەشکێنە خۆشی یەکت لەڕێگایە

### گا

توشی نەخۆشی دەبێت ئاگادار بە خۆت بپارێزە لەم وەرزەدا

### جیبوک

ئەم مانگە چاوت بەکەسێك ئەکەوێت کەزۆر ئازیزە لەدڵتا هەواڵێکی خۆشت پێ دەگات..

### قرژاڵ

هەتا دەتوانی یارمەتی خۆشەویستەکەت بدە دڵی مەشکێنە چونکە دڵی ناسکە..

### شێر

کاتێکی پڕ لەخۆشیو چالاکی بەسەر دەبەیت لەگەڵ خێزانەکەت.

### فەریک

یاری بەهەستی خۆشەویستەکەت مەکە چونکە دوایی باوەڕت پێ ناکات

### تەرازوو

ئەم مانگە بەرەو پێشەوە دەچێت سەرکەوتن وەدەست دێنی

### دووپشك

بەراستی لەگەڵ هاوڕێکانت هەڵس و کەوت بکە چونکە ئەوان ڕاستن لەگەڵتا

### کەوان

سەفرێکت لەڕێکایە پێ خۆش حاڵ دەبیت بەڵام ئاگاداربە

### کێسك

پەیوەندییەکی نوێ لەڕێگایە بەڵام بەقسەی خەڵك مەکە.

### دەلو

بایەخ بەجل وبەرگت بدە چونکە پلەیەکی بەرز چاوەڕوانتە

### نەهەنگ

هەتا دەتوانی پەیوەندیی خۆشەویستی بپارێزە چونکە زۆر ئاحەز چاویان لەدووتانە..

